بەشێک لە پەیامەکانی نوور



# بەری درەختی ئیمان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نووری

دایناوە

فاروق رەسوول یەحیا

کردوویە بە کوردی



بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# بەری درەختی ئیمان

بەدیعوززەمان
سەعیدی نوورسی
دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا
كردوویە بە كوردی

# پێشەکیی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. والصلاة والسلام على سيد الخلق أجمعين سيدنا محمد، وعلى آله وصحبه وأتباعه إلى يوم الدين.

پاش جەنگی جیهانی یەکەم و، زاڵبوونی کافران بەسەر بەشی زۆری وڵاتانی ئیسلام و، دوژمنایەتیی ڕاستەوخۆی بێ پەردەیان لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا، دەرکەوت جەنگی ئەمجارەیان بە نیازی هەڵکەندنی پایە و بنچینە و ڕەگی ئیسلامە لەناو دڵ و دەروون و بیری موسڵماناندا. لەو کاتەشەوە هەتا ئێستا بەردەوام خەریکی هێنانەدیی ئەم نیازەیانن..

لەبەر ئەوە، زانایەکی هەڵکەوتووی وەکو "مامۆستا سەعیدی نوورسی"ی وریا و ئاگادار لە بارودۆخی ئەم چەرخ و سەردەمەی دنیا و، شارەزا لە دژواری و تەنگژەکانی نێوان ئیمان و کوفری سەردەم، هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی بۆ دامەزراندن و جێگیرکردنی ئەو بناغە و بنچینانەی ئیسلام تەرخان کردبوو، هەروەك نووسینەکانیشی بە ئاراستەی ڕوونکردنەوەی

بناغەکانی ئەم ئایینە بوون، کە پێیان دەوترێت: (پایەکانی ئیمان). واتە لەبارەی: "ئیمان بە خوا و، مەلائیکەتانی و، کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و، قەدەر"ەوە.. هەر جارەی بە شێوازێك و، هەر نووسینەش بە جۆرە ڕوونکردنەوەیەکی نوێ و گونجاو بۆ ئەوانەی لەگەڵیان دەدوێت[1].

کاتێ دەست و پێوەندانی دوژمنانی خوا و ئایینی ئیسلام هەوڵ و تەقالای ئەم مامۆستا خەمخۆرەیان ڕەچاو کرد، هاتن مامۆستا نوورسی و قوتابیانی ئەویان لە بەندیخانەکاندا توند کرد، ئیتر چارەکە سەدەیەکی تەواو (١٩٢٦-١٩٥٠ز) ژیانیان لە بەندیخانە و دەست بەسەری و دوورخراوەییدا بەسەربرد و، چەندین جۆر ئەشکەنجە و ئازاریان دەرخوارد درا ..

بەڵام بەرزی و پیرۆزیی ئەرکەکەی سەرشانیان و، مەزنیی پاداشتە خواییەکەی، کە بەهەشت و ڕەزامەندیی خوای گەورەیە، هەموو ئازار و بەڵایەکی لە لا ئاسان کردبوون و، هێشتا لەو بارە ناهەموارانەی بەندیخانەشدا هەر لە ئەرکی سەرشانی خۆیان لایان نەدا و سستی ڕووی تێنەکردن. چونکە پزیشکی دڵسۆز ناتوانێت بەرامبەر دەردەدار و بیماران دەستەوستان دابنیشێت و بەهانایانەوە نەڕوات، بەڵکو پێویستە بێ وچان بە پێشوازییانەوە بڕوات و، دەرمان و چارەسەریان بۆ دەستنیشان بکات.

ئەم پەیامەی بەردەستیشت - خوێنەری بەڕێز! - یەکێکە لەو پەیامانەی کە لەبارەی بابەتەکانی "ئیمان"ەوە دەدوێن و، لە بارودۆخێکی لەو جۆرەدا نووسراوە کە ئاماژەمان بۆ کرد. دەبا بزانین بەسەرهاتی دانانی چۆن بووە:

---

(١) سەبارەت بەوەی کە مامۆستا نوورسی چۆن لەم چەرخ و سەردەمە گەیشتووە و، چ جۆرە چارەسەرێکی بۆ کێشەکانی داناوە و، چ شێوازێکیشی لە نووسینەکانیدا بەکارهێناوە، تکایە خوێنەری بەڕێز سەیری پێشەکیی کتێبی (وتە بچووکەکان) ل: ٥-٢٠ (چ ٢) بکات.

(کە لە مـانگی ئـەیلوولی سـاڵی ١٩٤٣زدا مامۆستا سـەعیدی نوورسـی و کۆمەڵێك لە قوتابیانی خرانە "بەندیخانەی دەنیزلی"[1] خواوەند دڵ و دەروونی مامۆستا نوورسیی کردەوە و یارمەتیی دا کە لە دوو ڕۆژی جومعەی پیرۆزدا پـەیامێك لـەبارەی ڕاسـتییەکانی "ئیمـان بـە غـەیب"ەوە بنووسـێت و لـە سـەرچاوەی نـووری قورئـانی پیرۆز وەریبگرێـت، کـە زۆر بـە ڕێکوپێکـی و جوانی، لەو بارودۆخە ناخۆشەدا[2] بە پوختی ڕاستییەکانی ئیمانی تێدا بـاس بکات. ئەو پەیامەشی ناونا: (پەیامی مەیوە) واتە (میـوە) یـان (بـەروبووم)[3]، چونکـە ئـەم پەیامـە بـە ڕاسـتی بـەروبوومی ڕاستییەکانی "ئیمـان بـە غـەیب" دەخاتـە ڕوو، کـە پەیامـەکانی نـوور لـە پێنـاوی ڕوونکردنـەوە و نزیـك خستنەوەیان لـە زەینـی مرۆڤـەوە تێدە کۆشـێت. کەواتـە ئـەم پەیامـە میـوە و بەروبوومێکی درەختـی نـووری ئیمانـە کـە بەندیخانـەی دەنـیزلی گرتوویـەتی و بەرهەمی هێناوە)[4].

با مامۆستا نوورسی خۆی باسی کاریگەریی ئەم پەیامەمان بـۆ بکـات، کـە چ ڕۆڵێکی لـە چارەسـەری گیـان و دڵ و دەروونـەکاندا بـووە. ئەمـەشمان لـە "پەیامی پیران"دا بۆ دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێت:

---

(١) دەنیزلی: ناوی مەڵبەندی پارێزگایەکە لە باشووری خۆرئاوای تورکیا.

(٢) چونکە ئەو کاتـە لـە زیندانێکی تاکـە کەسیدا بووە و، بەدەست ئازاری ئەو ژەهرەی کـە دەرخواردی درابوو دەتلایەوە و، گیرۆدەی ئـەو ئەشـکەنجە و سـووکایەتی پێکردنـە بـوو کـە دەهێنرایە ڕێی ئەوی پیری حەفتا ساڵە!

(٣) لەبەر ئـەوەی وشـەی: "مـەیوە"ی تورکی لـە زمـانی کوردیـدا ئـەو دوو واتایـەی سـەرەوە دەبەخشێت، لە پێشدا ویستم ئەم وەرگێڕانە کوردییە ناوبنێم: (میوەی درەختی ئیمان) تاکو لـە ناونیشانە ئەسڵییەکەوە نزیکـتر بێـت. بەڵام لـە دوایـیدا وام بـە ڕەوانـتر زانی کـە نـاوی: (بەری درەختی ئیمان)ی لـێ بنێم.

(٤) پێشەکیی چاپە عەرەبییەکەی ئەم پەیامە: (الثمرة من شجرة الإيمان) ص: ٨-٩.

(هەر کە قوتابیانی نوور و پەیامی "میوە" - کە بۆ بەندکراوان نووسراوە - ڕۆشتنە ئەو بەندیخانەیە، زیاتر لە دووسەد بەندکراو تۆبەیان کرد و، ڕێی ئایین و چاکە و گوێڕایەڵیی خوا و ئەنجامدانی فەرزەکانیان گرتەبەر، کە ئەمەش لە ماوەی سێ مانگ یان شتێك زیاتردا ڕووی دا. تەنانەت یەکێك لەوانە کە لە سێ کەس زیاتری کوشتبوو، وای لێ هات دەستی لە کوشتنی ئەسپێ دەگێڕایەوە! واتە نەك هەر تەنها بوو بە ئەندامێکی بێ زیان، بەڵکو بوو بە ئەندامێکی سوودبەخشی بە بەزەیی لە وڵاتدا!

فەرمانبەرە بەرپرسەکانیش بە سەرسووڕمانەوە سەیری ئەم ڕووداوانەیان دەکرد)[1]!

هەر لە "پەیامی پیران"دا بۆمان دەگێڕێتەوە کە چۆن قوتابیانی نوور بەوپەڕی شەوق و خۆشی و چالاکی و، لە پێناوی خزمەتگوزاریی ئیمان و قورئاندا، بۆ نووسینەوەی ئەم پەیامە لێبڕابوون:

(... بردینیان بۆ بەندیخانەی "دەنیزلی" و، لە هۆڵێکی گەورەدا بەندیان کردم کە تابڵێی بۆگەن و شێدار و سارد و سڕ بوو! لەوێشدا ئازار و خەم و خەفەتێکی زۆر لە چەند لایەکەوە ڕووی تێکردم)[2]..

پاشان ئەڵێ:

(چاودێریی پەروەردگار فریام کەوتەوە و، ئەو بەندیخانە سامناکەی بۆ گۆڕیم بە قوتابخانەیەکی نوور[3] و، دەرکەوت کە بە ڕاستی "بەندیخانە"

---

(١) پەیامی پیران: ل ١١٩، چاپی دووهەم.

(٢) پەیامی پیران: ل ١٢٦، چاپی دووهەم.

(٣) چونکە مامۆستا نوورسی ئەو بابەت و باسانەی لەمەڕ "ئیمان"ی لەسەر پارچە کاغەزی بچووك بچووك دەنووسی کە لەم لا و لەولا دەیبینین وهەڵیدەگرتن. پاشان بە هەر جۆرێ بۆی بڕەخسایە دەیگەیاندنە دەستی قوتابیانی کە لە ژوورەکانی تری بەندیخانەکەدا بوون، ئەوانیش

قوتابخانەی یووسفی‌یە! ئەوەبوو پەیامەکانی نوور کەوتنەوە بڵاوبوونەوە و، پاڵەوانانی قوتابخانەی "زەهراء"یش بە قەڵەمە ئەڵماسی و کارامەکانیان دەستیان دایە نووسینەوە و لەبەر گرتنەوەی پەیامەکان.

تەنانەت پاڵەوانەکەی نوور[1] لە ماوەی چوار مانگدا و لەو بارودۆخە ناهەموارەی دەوروبەرماندا زیاتر لە بیست نوسخەی لە پەیامەکانی "میوە" و "بەرگری" نووسی‌یەوە و، نووسینەوەی ئەم نوسخانەش بوو بەهۆی چەندین فتووحات چ لە ناوەوەی بەندیخانە و چ لە دەرەوەیدا، کە ئەمەش زیان و بێزاری‌یەکانی ئەو گیروگرفتەی بۆ گۆڕیین بە سوود و دڵخۆشی و، سەر لە نوێ نهێنی‌یەکی ترمان بۆ دەرکەوت لە نهێنی‌یەکانی ئایەتی:

﴿وَعَسى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (البقرة:٢١٦)..)[2].

سەبارەت بە چۆنیتیی دانانی ئەم پەیامە و گەیاندنی بە دەستی بەندکراوان، ئەم بڕگەیە دەهێنین کە لە کتێبێکی مێژووی ژیانی مامۆستا نوورسیدا هاتووە، تاکو خوێنەری بەڕێز پتر جێدەستی ئەم پەیامەی لە چاکسازیی باری ڕەوشتی و دەروونیی بەندکراواندا بۆ دەربکەوێت:

(نوورسی بە تایبەت گوفتاری ئەم پەیامەی ئاراستەی بەندکراوان کردووە. هەر بابەتێکیشی مەسەلەیەك لە بابەتەکانی "باوەڕ" ڕوون دەکاتەوە، وەك: ناسینی خوای گەورە و، زیندووبونەوە و، ڕۆژی دوایی، بە تایبەت هەر شتێك پەیوەندیی بە "کێشەی مردن"ەوە هەبێت. هەروەها ئەم پەیامە پوختەیەکی ئەو ڕاستییانەیە کە "پەیامەکانی نوور" پێش چاویان دەخەن.

---

یەکسەر نوسخەیان لەبەر دەگرتەوە و، ئنجا بە پەنامەکی و لەناو شقارتە و چەندین هۆکاری تر دەبرانە دەرەوەی بەندیخانە و، بڵاودەبوونەوە. بڕوانە: (الثمرة من شجرة الإيمان) ص: ٩.

(١) مەبەست لەو پاڵەوانە شەهید "حافظ عەلی"یە، خوا لێی خۆش بێت. بۆ زانیاری لەبارەیەوە بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (١٦٣)ی ئەم کتێبەی بەردەستت. (وەرگێڕ)

(٢) پەیامی پیران: ل ١٢٦-١٢٧، چاپی دووەم.

دوابەشی مەسەلەی هەشتەمیشی لە کاتی جەژنی قوربانندا نووسراوە کە دەکاتە ڕێکەوتی ٨/١٢/١٩٤٣ز. ئیتر قوتابیانی نوور و بەندکراوانی دیکە چەندین نوسخەیان لەم بەشە گرنگەی پەیامەکانی نوور نووسییەوە و، گەورەترین کاریگەریی هەبوو لە چاکسازی و باش بوونی ئاشکرای بەندییەکاندا. یەکەم جار زۆر بە نهێنی لە ناوەندی بەندیخانەکەدا بلاوکرایەوە، بەلام کاتێ دەستەلاتدارانی بەندیخانە باشبوونی ڕەوشتی بەندکراوانیان بەهۆی ئەم پەیامەوە ڕەچاو کرد، بواریان دا کە چەند نوسخەیەکی لەبەر بنووسرێتەوە، ئنجا وەك بەرگرییەك لە پەیامەکانی نوور ڕەوانەی دادگای "پیاهەلچوونەوە"(الإستئناف) و فەرمانگە تایبەتمەندەکانی ئەنقەرە کرا و، ڕۆلێکی تەوەرەیی هەبوو لە سەلماندنی بێ تاوانییاندا)[1].

ماوەتەوە خوێنەری بەڕێز دەرگاکانی دڵ و دەروون و گیان و ژیریی خۆی بخاتە سەرپشت و، دەست بە خوێندنەوەی ئەم پەیامە بکات.

لە خوای گەورە داواکارم کە یارمەتیمان بدات بۆ نیازی جوان و، تێگەیشتنی ڕاست و، ڕاستی لە کار و گوفتاردا.

وصلى الله على سيدنا محمد، و آله و صحبه و أتباعه إلى يوم الدين.
والحمد لله رب العالمين.

فارووق ڕەسووڵ یەحیا
٢٧/٧/١٩٨٩ز

(١) بڕوانە: الإسلام في تركيا الحديثة، بديع الزمان النورسي. تأليف شكران واحدة، ترجمه عن الإنجليزية: محمد فاضل، ص: ٣٨٦.

تیشکی یازدەهەم لە کتێبی:
(تیشکەکان)

# بەری درەختی ئیمان

ئەم پەیامە:

★ بەرگریی ئیمانە کە پەیامەکانی نوور بۆ بەرەنگاری کردنی ئیلحاد و کوفری موتلەق دەیکات، چونکە لەم بەندیخانەیەماندا لەمە زیاتر هیچ بەرگرییەکی ڕاستەقینە شك نابەین و، لە ئیمان زیاتریش بۆ هیچ شتێکی تر تێناکۆشین.

★ یەکێکە لە بەروبوومەکانی بەندیخانەی "دەنیزلی" کە لە دوو ڕۆژی جومعەی پیرۆزدا بەرهەمی هێنا.

سەعیدی نوورسی

بسم الله الرحمن الرحيم

# فَلَبِثَ فِي السِّجنِ بِضعَ سِنِينَ

(يوسف: ٤٢)

(له نهێنی‌یه‌كانی ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌وه تێده‌گه‌ین كه حه‌زره‌تی یووسف - دروودی له‌سه‌ر بێت- پێشه‌وای به‌ندكراوانه. كه‌واته به‌ندیخانه جۆره "قوتابخانه‌یه‌كی یووسفی‌یانه"یه. جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ژماره‌یه‌كی زۆری قوتابیانی نوور دوو جار ڕۆشتوونه‌ته ناو ئه‌م قوتابخانه‌یه، ئه‌وا ده‌بێ هه‌ندێك له‌و مه‌سه‌له ئیمانی‌یانه‌ی كه په‌یوه‌ندی‌یان به به‌ندیخانه‌وه هه‌یه له‌ناو خۆیاندا به یه‌كتریی بلێنه‌وه و لێیان بكۆڵنه‌وه، تاكو بیانكه‌ن به ڕابه‌ری خۆیان و، له‌م قوتابخانه‌یه‌دا - كه بۆ په‌روه‌رده‌كردن كراوه‌ته‌وه - ڕه‌وشت و هه‌ڵسوكه‌وتی خۆیانی پێ ڕاست بكه‌نه‌وه. وا ئێمه‌ش له پێشدا هه‌ندێ له كورته‌ی ئه‌و بابه‌تانه ڕوون ده‌كه‌ینه‌وه).

سه‌عیدی نوورسی

## مەسەلەی یەکەم:

**ساتێك بۆ خوا** ———————————

ئەم مەسەلەیە کە لە "وتەی چوارەم"دا ڕوون کراوەتەوە، دەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە کورتی بکەینەوە:

سەرمایەی ژیانمان تەنها ئەم بیست و چوار سەعاتەی شەو و ڕۆژە، کە یەکێکە لە بەخششەکانی خواوەندی بەدیهێنەری میهرەبانمان، کەواتە با لە هەر سەعاتێك لەم سەعاتانەدا ئەوەی بۆ ژیانی هەردوو دنیامان پێویستمانن بەدەستیان بهێنین.

خۆ ئەگەر یەك سەعات، کە سەروزیادی نوێژە فەرزەکانمانە، بۆ ژیانی هەمیشەیی ئەودنیامان بەکار نەهێنین و بیست و سێ کەی تریشی بۆ ژیانی ئەم دنیا کورتەی ئێستامان، ئەوا هەڵەیەکی ئەوەندە گەورە دەکەین کە هیچ مرۆڤێکی ژیر بە ڕاستی نازانێت..

بێ گومان لە ئەنجامی ئەم هەڵەیەشماندا تووشی چەند ئاکامێکی ناهەمواری وەك: (دڵڕەقی و تەنگ و تاریکی ڕۆح) دەبین، کە ئەمانەش تێکرا ڕووناکیی ڕەوشتەکانمان لێڵ دەکەن و، خاوێنیی گیانەکانیشمان بەرەو چەپەڵی دەبەن، جگە لەوەی کە ژیانمان بە نائومێدی و بێزاری لێ دەڕوات و بێتاقەتی سەرمان تێدەکات، تا وامان لێ دێت لەم قوتابخانە یووسفییە و لەم تاقیکردنەوە و بەڵایەدا سوود لە هیچ پەند و دەرسێك وەرنەگرین کە پێمان بگەیەنن و چەند پلەیەك بەرزمان بکەنەوە. واتە زیانێکی گەلێ زۆر دەکەین.

بەڵام ئەگەر تەنها یەك سەعات لە بەجێهێنانی پێنج فەرزەی نوێژدا بەسەربەرین، ئەوا هەموو سەعاتەكانی مەینەتی و تاقیكردنەوەمان دەبن بە ڕۆژێكی عیبادەت.

وەك بڵێی بە فەڕ و بەرەكەتی ئەم سەعاتەی كە بە پەرستن بەسەرمان بردووە، هەموو بیست و چوار سەعاتەكە سیفەتی هەمیشەییان دەست دەكەوێت و لە حوكمی چەند سەعاتێكی نەبڕاوەی هەتاهەتاییدا دەبن..

ئەو كاتەش پەڵە هەور و شەوەزەنگی نائومێدی لەسەر دڵ و گیانمان دەڕەوێنەوە و، ئەم سەعاتە دەبێتە كەفارەتی هەندێك لەو هەڵە و تاوانانەمان كە لەوانەیە بووبن بەهۆی بەندبوونمان. بەمەش حیكمەتی تاقیكردنەوەمان بە (بەندیخانە) بۆ دەردەكەوێت و، بەندیخانەشمان بۆ دەبێت بە قوتابخانەیەك كە وانەی سوودبەخشیی تێدا وەردەگرین و، لەگەڵ هاوەڵانی ئەم گرفت و موسیبەتەماندا دەبینە خەمڕەوێنی یەكتر و دڵی یەكتریی تێدا دەدەینەوە.

لە "وتەی چوارەم"دا نموونەیەك باس كراوە، گەورەیی ئەو زیانە ڕوون دەكاتەوە كە تووشی ئەو كەسانە دەبێت بە دوای دنیایاندا هەناسەبڕكێیانە و، پشت لە دواڕۆژ هەڵدەكەن..

ئەمەش نموونەكەیە:

هی وا هەیە (دە) یان (پازدە) لیرە لەو (بیست و چوار) لیرەیەی كە هەیەتی، بە بلیتی قوماری یانسیبی دەدات، كە گریمانی بردنەوەی لەوانەیە یەك لە هەزار بێت. بەڵام یەك سەعات لە بیست و چوار سەعاتی ژیانی ڕۆژانەی خۆی بلیتێكی پێ ناكڕێت كە گەنجینەیەكی هەمیشەیی دواڕۆژی پێ قازانج دەكات، لە كاتێكدا كە گریمانی بردنەوەی ئەم بلیتە بۆ ئەو ئیماندارانەی بە چاكی كردەوەكانیان كۆتایی پێ دێت، لە هەزاردا نۆسەد و نەوەد و نۆیە. هەروەك هەموو پێغەمبەران – درودیان لەسەر بێت- ئەمەیان چەسپاندووە و

ڕایانگەیاندووە و، چەندین ئەولیا و پیاوچاکی لەژمارەبەدەریش ئەم هەواڵەیان پشت ڕاست کردووەتەوە.

جا دەبێ ئەوانەی کە بە تەنگ کاروباری وڵاتەوەن، دڵیان بەم وانە پڕ لە پەند و ئامۆژگارییە بکرێتەوە کە پەیامەکانی نوور دەیلێتەوە. چونکە بە تاقیکردنەوە چەسپاوە: بەڕێوەبردنی هەزار کەسی ئیماندار، لەوانەی لە سزای دۆزەخ دەترسن و هەمیشە لە خوا دەپاڕێنەوە تاکو لە دۆزەخ دووریان بخاتەوە، گەلێ ئاسانترە لە بەڕێوەبردنی دە کەس لەوانەی کە وازیان لە نوێژکردن هێناوە، یان بەدڕەوشت و بێ باوەڕن و، بە تۆڵە و بەندکردنی دنیا نەبێت ڕێگای باش ناگرنەبەر و واز لە هەڵەکانیان ناهێنن.

* * *

## پوختەی مەسەلەی دووهەم:

——————— مرۆڤ چۆن لە مردن ڕزگاری دەبێت؟!

هەروەك لە پەیامی "ڕابەری لاوان"دا بە جوانی ڕوونم کردووەتەوە:

مردن شتێکە چار نی‌یە دەبێ بچێژرێت. تەنانەت هاتنی مردن لە هاتنی شەو بە دوای ئەم ڕۆژەدا و زستان بە دوای ئەم پایزەدا گەلێ بێگومانترە. هەروەك ئەم بەندیخانەیە میوانخانەیەکی کاتی‌یە و هێشتا بە تەواوی چۆڵ نابێت یەکسەر پڕ دەبێتەوە، دنیاش بەو چەشنەیە، وەکو میوانخانە و مەنزڵگایەك وایە کە لەسەر ڕێگای کاروانەکاندا دروست کراوە.

کەواتە ئەو مردنەی کە هەموو شارێك سەدان جار لە دانیشتووانی خاڵی دەکاتەوە و ڕووەو گۆڕستان بەڕێیان دەکات، داخوازی شتێکی ئەوتۆیە کە لەم ژیانە فانی‌یە گەلێ گەورەتر و باڵاتر بێت.

لە ڕاستیدا "پەیامەکانی نوور" ئەم گرێ کوێرەیان کردووەتەوە و، ئەو ڕاستی‌یە سەرسووڕهێنەرەیان دەرخستووە. کە کاکڵەکەی بریتی‌یە لەوەی:

مادەم مردن ناکوژرێت و دەرگای گۆڕیش داناخرێت، ئەوا دەبێ گرنگترین شتێك بیری مرۆڤ سەرقاڵ بکات و گەورەترین گیروگرفت بێت لە ڕێیدا، ئەم پرسیارە بێت کە:

چۆن لە دەست جەللادی مردن و بەندیخانەی یەك کەسی گۆڕ ڕزگارمان بێت؟

پەیامەکانی نوور، بە ئەندازەی بێ گومانیی: (دوو کەڕەت دوو دەکاتە چوار) و، بەهۆی بەرەکەتی نووری قورئانی پیرۆزەوە، چەسپاندوویانە کە ئەم گیروگرفتە چارەسەر دەکرێت، ئەویش بە کورتی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

"مردن" یان ئەوەیە ئیعدامێکی هەمیشەیی و لەناوچوونێکی تەواوەتی‌یە کە بە گشتی تووشی مرۆڤ و کەسوکار و خۆشەویستانی دەبێت.. یان بە بۆنەی بڕوانامەی ئیمانەوە، بریتی‌یە لە کارتەواوکردنی دنیا و، وەرگرتنی پاسپۆرتی سەفەر بۆ ڕۆیشتن بەرەو جیهانێکی باشتر و کۆشك و تەلاری بەختەوەریی هەمیشەیی.

"گۆڕ"یش، یان بەندیخانەیەکی تاریکی یەك کەسی و بیرێکی قووڵە.. یان دەرگایەکە لەسەر باخچە و میوانخانەیەکی هەمیشەیی خراوەتە سەرپشت، کە دوای بەربوون لە بەندیخانەی دنیا مرۆڤ پیایدا گوزەر دەکات.

پەیامی "ڕابەری لاوان" ئەم ڕاستی‌یەی بەم نموونەیە ڕوون کردووەتەوە:

لە مەیدانی ئەم بەندیخانەیەدا چەند سێدارەیەك دانراون و پاڵیان بە دیوارێکەوە داوەتەوە، لە پشتی ئەو دیوارەشەوە فەرمانگەیەك هەیە بەخششی باش بە هەموو ئەوانە دەدات کە بەشداری‌یان تێدا کردووە. ئێمەش کە پێنج‌سەد کەسی بەندکراوین چاوەڕوانی نۆرەی خۆمانین تاکو یەك لە دوای یەك بۆ ئەو مەیدانە بانگ بکرێین. چاریش نی‌یە -بمانەوێت و نەمانەوێت- دەبێ بڕۆین. جا یان ئەوەیە بە هەر یەك لە ئێمە دەڵێن: (وەرە فەرمانی لە سێدارەدانت وەربگرە و بە داری سێدارەکەتدا سەربکەوە)، یان پێی دەڵێن: (فەرمانی بەندکردنت بە تەنیایی و هەمیشەیی وەربگرە و لەو دەرگایەوە بڕۆرە ژوورەوە).. یان پێی دەوترێت:

(مژدە بێت! بلیتێکت بۆ دەرچووە کە قازانجی ملیۆنان لیرەی زێڕینی تێدایە، فەرموو وەری بگرە)!

ئەوەتا بە چاوی خۆمـان دەبینـین لـەم لا و ئـەولادا ئاگـاداری بـۆ ئـەم بانگەوازە بڵاوکراوەتەوە و، دەبینین خـەڵکی بـە سێدارەکاندا سـەردەکەون، جا هی وایان هەیە پیایدا شۆڕ دەبێتەوە و، هی وایشیان هەیـە کـە وەك پلیکانـە پیـایدا سـەردەکەون و لــەوێوە دەڕۆنــە نــاو فەرمانگەکــەی ئــەودیو کــە بەخششەکانی تێدا پێشکەش دەکرێـن و، بەپێی وتـەی فەرمانبەرە بـەرزەکانی ئەو فەرمانگەیە، کـە هیـچ گومـانێك لـە وتـەکانیاندا نییـە و، بـە دڵنیاییـەکی ئەوتۆ کە وەك بە چاو ببینین، ئاوا دەزانین چی لەوێ ڕوودەدات.

ئا لەم کاتەدا دوو دەستە خەڵك هاتنە ناو بەندیخانەکەمانەوە:

"دەستە"یـەکیان کەرەسـەی گۆرانـی و ڕابواردن و شووشـەی شـەراب و شیرینییان لـەگەڵ خۆیان هەڵگرتووە، کە لە ڕواڵەتدا وەك هـەنگوین شیرینن، بەڵام ناوەوەیان یەکپارچە ژەهرە و، شەیتانە ئادەمییەکان تێیان کردووە.

"دەستە"کـەی تریشـیان چـەند کتێبێکـی پـەروەردەیی و، بڵاوکـراوەی ڕەوشتی و، خواردن و خواردنەوەی پاك و خاوێنیان لەگەڵ خۆیاندا هێنـاوە و پێشکەشمانی دەکەن و، بە یەکدەنگی و دڵنیاییەوە پێمان دەڵێن:

(ئەو خواردەمەنییانـەی دەستە و کۆمەڵەکـەی تـر پێشکەشتانی دەکـەن، تەنها بۆ تاقیکردنەوەیە. جا ئەگەر لێتـان وەرگرتـن و پێیـان ڕازی بـوون، ئـەوا ئـەنجامتان – وەك لـە بەرچاوتاندایـە – لەسـەر ئـەو سـێدارە و پـەتی قەنارانـە کۆتایی پێ دێت!

بـەڵام ئەگـەر بـەم دیارییانـە ڕازی بـن کـە ئێمـە بـە فـەرمان و نــاوی فەرمانڕەوای ئەم وڵاتەوە پێشکەشـتانی دەکـەین و، ئـەو ڕێنمـایی و زیکرانـەش بخوێننەوە کە لەو کتێبانـەدان، ئەوا لـە پەتی قـەنارە ڕزگارتـان دەبێـت و، ئـەو بلیتـەش وەردەگـرن کـە لـەو فەرمانگەیـەی ئەودیو دەبەخشرێتەوە و قــازانجی زۆری تێدایە و، دیاریی چاکە و بەخششی پادشایە.. ئێمـە هەرچییـەکتان پـێ دەڵێین لێی دڵنیابن و وەك بە چاو ببینن ئاوا بە تەواوی باوەڕی پێ بکەن.

بەڵام ئاگادار بن! توخنی ئەو شیرینی‌یە هەنگوین ڕەنگە نەکەون - کە حەرام و گومان لێکراوە - چونکە ئەگەر لێی بخۆن، ئەوا بەهۆی ژەهرەکەیەوە سکتان پێچ دەخوات و تا دەگەنە لای پەتی قەنارەکە ئازار دەچێژن).

هەر بەم جۆرە و لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە:

ئەو ئیماندارانەی کە ژیانیان بە گوێڕایەڵیی خوای گەورە بەسەر بردووە، خواوەندیش بە چاکە کۆتایی بە کردەوەکانیان هێناوە، لە دوای تەواوبوونی ماوەی ژیانی دنیایان، قەدەری خوای گەورە چەندین گەنجینەی نەبڕاوە و هەمیشەییان پێ دەبەخشێت.

بەڵام ئەوانەی کە لەناو گومڕاییدا ڕۆچوون و بەردەوام لەسەر چەوتە ڕێ هەنگاو دەنێن، بێ ئەوەی پەشیمان ببنەوە و بۆ لای خوای خۆیان بگەڕێنەوە.. ئەوانە، هەندێکیان کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نی‌یە، ئیعدامی هەمیشەیی دەچێژن. ئەوانەش کە باوەڕیان بە مانەوەی ڕۆح لە دوای مردن هەیە، بەڵام لەسەر نەفامی و سەر لێ شێواویی خۆیان بەردەوامن، دەخرێنە بەندیخانەی تاکە کەسیی تاریك و هەمیشەییەوە، بە دڵنیاییەکی ئەوتۆ کە ڕێژەکەی دەگاتە لەسەدا نەوەد و نۆ بڕیاری زەرەرمەندیی هەمیشەییان وەردەگرن.

بەڵێ، ئەم هەواڵە ڕاستە سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەر[1] - درودیان لەسەر بێت - ڕایدەگەیەنن، ئەو پێغەمبەرانەی کە چەندین

---

(١) ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە کە: ئەبوو زەڕ - خوای لێ ڕازی بێت - دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم ﷺ کرد: ژمارەی پێغەمبەران(ئەنبیاء) چەند دەبێت؟ فەرمووی: (سەد و بیست و چوار هەزار، لەوانەش بەشێکی زۆریان، سێ‌سەد و پازدەیان (ڕەسوول)ن.
بڕوانە: (مشكاة المصابيح ١٢٢/٣ت ٥٧٣٧ قال المحقق: حديث صحيـــح). هەروەها: (زاد المعاد، تحقيق الارناؤوط ٤٣/١ - ٤٤). (وەرگێڕ)

موعجیزە تەسدیقی دەعواکانیان دەکات، ئنجا لە سەد و بیست و چوار ملیۆن زیاتریش لەو ئەولیایانەی کە شوێن پێی پێغەمبەرانیان هەڵگرتووە و تەسدیقیان کردوون، لە ڕێی (کەشف و چێژی تایبەت بە خۆیانەوە) هەمان هەواڵ ڕادەگەیەنن..

هەروەها چەندین کەس لە زانایانی لێکۆڵەر و[1] موجتەهیدان و صیددیقان - کە لە ژمارە نایەن - ئەو داوایەی پێغەمبەرانیان بە بیر و ژیری چەسپاندووە و، تەسدیقیان کردووە و، بەوپەڕی دڵنیاییەوە هەمان هەواڵیان ڕاگەیاندووە کە پێغەمبەران و ئەولیاکان ڕایانگەیاند.

جا ئەم سێ دەستە و کۆمەڵە گەورە و زۆرەی بەرەی حەق و ڕاستی، کە لە ڕاستیدا ڕابەر و مانگ و خۆری ڕووناکی مرۆڤایەتین، هەموو بە یەکدەنگی و تەواتور هەواڵی هەمان ڕاستی ڕادەگەیەنن.

کەواتە ئەو کەسەی بایەخ بە فەرمان و ڕاگەیاندنەکانی ئەو سێ دەستە و کۆمەڵە نادات و، ئەو ڕاستەشەقامە ناگرێتەبەر کە بە ڕێنمایی ئەوان مرۆڤ دەگەیەنێتە بەختەوەریی هەمیشەیی و، گوێ بەو دواڕۆژ و ئاکامە ئازاربەخشە نادات کە لە سەدا نەوەد و نۆ دێتە ڕێی، لە کاتێکدا کە هەمان مرۆڤ گەر لە شتی تردا ڕێگایەك ڕێژەی زیانی لە سەدا یەك بێت و یەك کەسیش ئەو هەواڵەی بداتێ، نایگرێتەبەر و ڕێگایەکی تر - با درێژیش بێت - بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت..

ئەو کەسەی کە ئەمە حاڵیەتی، دەبێ مرۆڤێکی چەندە زەرەرمەند بێت؟!

---

(١) یەکێك لەو زانا لێکۆڵەرانە "پەیامەکانی نوور"ە کە لە ماوەی بیست ساڵی ڕابوردوودا سەرسەختترینی فەیلەسووفە ماددییەکان و زەندیقترین کەسیشی بۆڕداوە و، تا ئێستاش لە گۆڕەپانی زۆرانبازیدا قۆڵی لێ هەڵماڵیوە و ڕاوەستاوە و، لە بەردەستی هەموو کەسێکدایە و، هەموو کەسێك دەتوانێت بیانخوێنێتەوە بێ ئەوەی بتوانێت پووچەڵیان بکاتەوە! (دانەر)

بەڵێ، ئەم جۆرە کەسانە وەك مەستێك، یان وەك شێتۆکەیەکی بەدبەخت وان، کە لەو کاتەدا چەندین دڕندەی خوێنمژ و سامناك دەورەیان داوە، دەچێت خۆی بە ئازاری گەزتنی مێشەوە دەخافڵێنێت!

هۆی ئەمەش بریتییە لەوەی کە: ئەو مرۆڤە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو هەموو هەواڵە ڕاستەی لە لایەن ئەو ڕاستگۆ لەژمارەبەدەرانەوە پێ گەیشت، کەچی وازی لەو ڕێگا کورتە گومان لێ نەکراوە هێنا کە دەیگەیەنێتە بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەیی و، لە بریی ئەوە ڕێگایەکی درێژتر و نالەبار و هەڵەت و تەسکی گرتەبەر، کە بێ هیچ گومانێك دەیگەیەنێتە بەندیخانەی دۆزەخ و بەدبەختیی هەمیشەیی. ئیتر بەم چەشنە "ژیری" و "دڵ"ی خۆی لەدەست دا و، "گیان"ی خۆی شێواند و، مرۆڤایەتییەکەشی داڕماند.

ئەمەش وەك وتمان، لە کاتێکدا ڕوودەدات کە مرۆڤ لە کاروباری دنیایدا هەرگیز ڕێگایەکی وا ناگرێتەبەر لە سەدا یەك گریمانی زیانی تێدا بێت و یەك کەسیش ئەم هەواڵەی پێ دابێت، با ڕێگایەکی کورتیش بێت. بەڵکو ڕێگایەکی تر با درێژیش بێت و سوودیشی تیا نەبێت، هەڵدەبژێرێت، مادەم بێ زیان بێت.

جا مادەم ڕاستیی ئەو ڕەفتارە بەم جۆرەیە کە باسمان کرد، ئەوا دەبێ ئێمەمانان کە تووشی بەندی بووین، بەوپەڕی دڵخۆشی و ڕازی بوونەوە دیارییەکانی دەستە و تاقمی دووهەم وەربگرین، تاکو بە تەواوی تۆڵەی خۆمان لە موسیبەتی بەندیخانە بسێنینەوە.

چونکە وەك لەزەتی یەك خولەکی تۆڵەسەندنەوە و، خۆشیی چەند خولەکێك و بەسەربردنی چەند سەعاتێك لە کاری بێهوودەدا ئێمەی گەیاندە بەندیخانە، کە هەندێکمان پازدە ساڵ و هەندێکی تر دە و هەندێکی تر پێنج یان دوو یان سێ ساڵی تێدا بەسەر دەبەین. دەبا لە تۆڵەی ئەمەدا لووتی بەندیخانە

بتۆزێنینەوە و، بە وەرگرتنی دیاری‌یەکانی کۆمەڵی دووهەم، ئەم سەعاتە کەمانەی ماوەی بەندیمان بکەین بە چەند ڕۆژێکی خوا پەرستی و، دوو ساڵ و سێ ساڵی ئێرەمان بکەین بە (بیست) ساڵ و (سی) ساڵ لە تەمەنی هەمیشەییدا و، بیست ساڵ و سی ساڵی بەندیخانەشمان بکەین بە ملیۆنان ساڵی هەمیشەیی..

بەم چەشنە هەموو ئەو حوکم و فەرمانانەی لێرە لەسەرمان دەردەچن، ببن بەهۆی ڕزگاربوونمان لە بەندیخانەی دۆزەخ. ئیتر ئەو کاتە لە بەرامبەر خەفەت و پەژارە و گریانی ئەم دنیامان، ئەودنیامان بە ڕوومانەوە پێدەکەنێت و، دەریدەخەین کە لە ڕاستیدا بەندیخانە قوتابخانەیەکی پەروەردەییە بۆ ڕێککردنی هەڵسوکەوت و ڕەوشتەکان.

دەسا با بەرپرسیاران و کاربەدەستانی بەندیخانە بە چاوی خۆیان ببینن کە: ئەو کەسانەی ئەوان بە پیاوکوژ و تاوانباریان لە قەڵەم دەدان و لایان وابوو ئاسایش تێکدەدەن، با بزانن هەموو ئەوانە بوون بە قوتابی لە قوتابخانەیەکی پەروەردەیی وادا کە ئەدەب و ڕەوشتی جوان و بەرزی تێدا فێر دەبن و، بوون بە چەند ئەندامێکی سوودبەخش لەناو وڵات و هاووڵاتیاندا..

با ئەمە ببینن و.. سوپاسی زۆری خوای خۆیان بکەن.

* * *

## مەسەلەی سێهەم:

——————— لەسەر شاشەی ئیماندا

**ئەمەی خوارەوە ڕووداوێکی پڕ لە پەندە، زووتر لە پەیامی "ڕابەری لاوان"دا بە درێژی باس کراوە. ئەمەش پوختەکەیەتی:**

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی (جەژنی کۆماری)دا لە بەردەم پەنجەرەی بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" کە بەسەر قوتابخانەیەکی ئامادەیی کچاندا دەڕوانێت، دانیشتبووم.. لەو کاتەدا قوتابیی‌یە نەوجەوانەکانی ئەو قوتابخانەیە، بەوپەڕی خۆشی و شادی، سەما و یاری‌یان دەکرد..

یەکسەر لەسەر شاشەیەکی مەعنەوی، حاڵی پاش پەنجا ساڵی ئەو قوتابیانەم هاتە بەرچاو! بینیم لە شەست قوتابیدا پەنجایان لەناو گۆڕەکانیاندا دەبن بە خاك و سزا دەدرێن، دە دانەکەی تریشیان بوون بە چەند پیرەژنێکی ناشیرینی حەفتا هەشتا ساڵە و ئەو جوانی‌یەی دەموچاویان نەماوە و ئاڵۆزاوە و بە تەواوی چرچ بووە و، بەدەست ئەو کەسانەوە خەم و ئازار دەچێژن کە کاتی خۆی چاوەڕوانیی سەرسووڕمان و خۆشەویستی‌یان لێ دەکردن، بەڵام وا ئێستا بە چاوی سووکایەتی و بێزەوە سەیریان دەکەن و، ئەمانیش لە ناچاریدا خەفەت بۆ لەدەستچوونی ڕۆژانی جوانی و لاوی‌یان دەخۆن، چونکە پاك و خاوێنیی خۆیان تێدا نەپاراست!

بەڵێ، بەوپەڕی دڵنیایی و بێگومانی ئەمەم بینی. ئیتر خۆم بۆ ڕانەگیرا و، بۆ حاڵی ئەوان دەستم بە گریانێکی هێندە گەرم و بەکوڵ کرد کە سەرنجی هەندێ لە هاوەڵەکانی بەندیخانەمی ڕاکێشا و، بە پەلە هاتن و هەواڵیان لێ پرسیم.

منیش پێم وتن:

– (ئێستا وازم لێ بهێنن و لێم دوور بکەونەوە).

بەڵێ، ئەوەی کە بینیم هەرگیز خەیاڵ و ئەندێشە نییە، بەڵکو ڕاستییە. چونکە هەروەك ئەم هاوین و پایزە دەبن بە زستان، هەر بەو جۆرەش لە دوای هاوینی لاوی و پایزی پیری، زستانی گۆڕ و بەرزەخ دێتە کایەوە.

خۆ هەروەك دەتوانرێت ڕووداوەکانی پەنجا ساڵی ڕابوردوو بە ئامێرێکی وەك سینەما پیشان بدرێت، گەر بیشتوانرایە – بە هەمان جۆر – ڕووداوەکانی پەنجا ساڵی ئایندە و ئەو بەسەرهاتانەش کە دواڕۆژ بەسەر گومڕایاندا دێت، پیشان بدرێت، ئەوا تا دەیانتوانی بۆ ئەو شتانەی کە ئێستا پێی شادمانن و بۆ ئەو حەرامانەش کە لەم کاتەدا چێژی لێ وەردەگرن، دەگریان و خەم و ئازاریان دەچەشت!

لەم کاتەدا کە لەم تێرامانەدا ڕۆچووبووم و بیرم لای بینینی دیمەنەکانی ئەو شاشە مەعنەوییە بوو کە لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"دا پیشانم درا.. لەم کاتەدا، کەسێکی مەعنەویی وەك نوێنەری (شەیتانی ئینس)م لە بەردەمدا لێ ڕاست بووەوە و، بانگی خەڵکیی بۆ لای بەڕەڵایی دەکرد و جاڕی برەودانی بە گومڕایی دەدا.. پێی وتم:

– (ئێمە دەمانەوێت هەموو تام و لەزەتێکی دنیا بچێژین و هانی کەسانی تریش بدەین بیچێژن.. چی دەکەین با بیکەین.. وازمان لێ بهێنە).

لە وەڵامدا پێم وت:

- مادەم لە پێناوی دەستخستنی چێژ و لەزەتێکی جوزئی و کەمدا خۆت دەهاویتە ناو باوەشی گومڕایی و هەرزەییەوە و، مردن لە بیری خۆت دەبەیتەوە، ئەوا بزانە کە بە گوێرەی ئەو گومڕاییەی تیایدایت و، سەبارەت بە تۆ زەمانی "ڕابوردوو" مرد و ڕۆیشت و نەما و بوو بە گۆڕستانێکی گەورەی سامناك و گۆڕەپانێکی چۆڵ و تاریکی پڕ لە مەترسی کە هەرچی تەرم و شوێنەوار هەن تیایدا ڕزیون..

کەواتە ئەگەر کەمێك ژیریت هەبێت و خاوەنی دڵێکی زیندوو بیت، دەزانیت کە ئەو ئازارانەی - بە بۆنەی گومڕاییەکەتەوە - لە مردنی هەمیشەیی و لە جۆرە جیاجیا و لەژمارەبەدەرەکانی جودایی کەسوکار و خۆشەویستانتەوە پەیدا دەبن، سەرجەمی ئەو تام و چێژە جوزئییە مەستکەرانە لەناو دەبەن کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەیان چێژیت.

جا هەروەك "ڕابوردوو" سەبارەت بە تۆ شتێکی نەبووە، "ئاینده"شت - بەهۆی بێ ئیمانیتەوە - هەر وایە. بەڵکو داهاتوو سەبارەت بە تۆ مەیدانێکی چۆڵ و تاریك و مردووی سامناکە. هەر کەسێك دێت و بە زەمانی "ئێستا"دا تێپەڕ دەبێت، دەستی جەللادی مردنی پێ دەگات و دەیگرێت و ڕەوانەی فەنا و نەمانی دەکات.

تۆیش مادەم بە حوکمی ژیریت پەیوەندیت لەگەڵ هەموو ئەو جیهانانەدا هەیە (کە لە ڕابوردوودا هاتن و ڕۆشتن) ئەوا هەرچی دڵتەنگی و ئازاری زۆری (ئاینده)ت هەن، ئەو ئاییندەیە بەسەر کەللە مولحیدانەکەتدا دەیانبارێنێت و، هەرچی تام و چێژی جوزئی و هەرزە ئاساشت هەن، هەموویان لەناو دەبات!

بەڵام ئەگەر واز لە هەرزەیی و ڕێگای گومڕایی بهێنیت و، ڕێی ئەو ئیمانە تەحقیقییە بگریتەبەر کە لەسەر چەندین بناغەی زانستی ڕاگیر بووە و، لەسەریشی بەردەوام بیت، ئەوا بەهۆی نووری ئەو ئیمانەوە دەبینیت کە:

زەمانی دێرینی "ڕابوردوو" شتێکی "نەبوو" نیەیە، ئەو گۆڕستانەش نیەیە کە هەرچی شت هەیە دابڕزێنێت، وەك لە گومڕاییدا وات هەست دەکرد. بەڵکو جیهانێکی ڕووناکە و لە ڕاستیدا هەیە و لە پاشاندا دەبێت بە "ئاینده". ئەم ئاینده‌یەش بریتی‌یە لە مەیدانێك بۆ چاوەڕوانی کردنی ئەو (گیانانەی) کە ماون و چاوەڕێی زیندووبوونەوە دەکەن، تاکو بۆ ئەو بەهەشتە هەمیشەییە بڕۆن کە بۆیان ئامادە کراوە..

کەواتە تۆ هێشتا لەم دنیایەدا دەژییت، "ئیمان" تامی بەهەشتی هەمیشەییت - بە ئەندازەی پلەی ئیمانەکەت - پێ دەچێژێت.

هەروەها "ئاینده"ش شێوێکی تاریك و پڕ لە دڵتەنگی و ئازار و سامناکی نیەیە، وەك لە ڕێگای گومڕاییدا وا دەردەکەوێت. بەڵکو بەهۆی نووری ئیمانەوە دەبینیت ئەو ئاینده‌یە بریتی‌یە لە چەند مەنزڵگایەکی بەختەوەریی هەمیشەیی کە خواوەندی بەخشندە و میهرەبان و شکۆمەند، کە بەخشش و میهرەبانی‌یەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە، بۆ بەندەکانی ئامادەی کردوون.

بەڵێ، کاتێ بە چاوی ئیمان دەڕوانیت، بەو جۆرەیان دەبینیت. چونکە هەروەك خواوەند وەرزی بەهار و پاییزی کردووە بە دوو سفرە و خوانی ڕازاوەی پڕ لە نیعمەت و خواردەمەنی، بە هەمان جۆر ئەم خواوەندە چەندین سفرە و خوانی میوانداریی لەو کۆشکە بەرز و ڕازاوانەشدا ئامادە کردووە و، پیشانگاکانی چاکە و بەخشایشە زۆرەکانی خۆی لەوێ کردووەتەوە و، خەڵکیشی خستووەتە تاسەوە بۆ ئامادەبوونی سەر ئەو سفرە و خوان و پیشانگایانە. لە دواییدا دەشبرێن بۆ ئەوێ!

بەڵێ، ئیماندار - هەر کەسەو بەپێی پلەی ئیمانەکەی - بەم جۆرە لەسەر شاشەی ئیماندا شتان دەبینێت و، بەم پێیە دەتوانێت هەر لەم دنیایەدا هەست بە هەندێ لەو نیعمەتە نەبڕاوە و هەمیشەییانەی ئەوێ بکات.

کەواتە چێژ و لەزەتی ڕاستەقینە و بێگەرد، کە هیچ ئازارێکی تێکەڵ نەبوبێت، تەنها لە ئیماندایە و، هەر تەنها بە ئیمانیش ئەو لەزەتانە دەست دەکەون.

هەزاران ئەنجام و ئاکام و هەزاران میوە و بەروبوومی بەتام و لەزەت هەن، کە هەر لەم دنیایەدا ئیمان بەرهەمیان دەهێنێت. بەڵام لێرەدا تەنها یەکێکیان بۆ نموونە ڕوون دەکەینەوە:

وا دابنێ کوڕە تاقانە خۆشەویستەکەت لەناو جێدا کەوتووە و لە سەرەمەرگدایە و، تۆیش لەتاوا نوقمی نائومێدی بوویت و، لە خەفەت و ئازاری لێکدابڕان و جودایی هەمیشەیی کۆرپەکەتدا دەتلێیتەوە.. وا دابنێ لەم کاتەدا کە لەوپەڕی بێ هیوایی و نائومێدی دایت، پزیشکێکی لێزانی وەك حەزرەتی "خضر" یان حەزرەتی "لوقمان" - درووودیان لەسەر بێت - بە فریاتەوە هات و، دەرمانێکی دژی ژەهرەکانی ئەو نەخۆشی‌یەی بە منالەکەت دا و، منالەکەش یەکسەر چاوی بە خۆشی و جوانیی ژیانی دنیادا هەڵهێنایەوە و، لە دەستی مردن ڕزگاری بوو..

ئایا دەبێ ئەندازەی دڵخۆشی و کامەرانیت لەم کاتەدا چەندە بێت؟!

ئەو ملیۆنان کەسانەش کە لە گۆڕستانی ڕابوردووداں و وەك ئەم کۆرپەیەت خۆشت دەوێن و، پەیوەندی‌یەکی بەتینت لەگەڵیاندا هەیە، بە هەمان جۆرن. چونکە لەو کاتەدا کە تۆ لات وایە خەریکە لەناو دەچن و نامێنن، حەقیقەتی ئیمان دێت و لە کلاوڕۆژنەی دڵەوە نوورێك ئاراستەی ئەو گۆڕستانە دەکات کە پێت وابوو جێگای لەناوچوون و ئیعدامکردنە. ئنجا هەر ئەوەندەی ئیمان ئەم نوورەی ئاراستە کردن، ئەوا یەکسەر - وەك کارەکەی لوقمانی حەکیم لەگەڵ منالەکەدا - دەردەکەوێت کە ئەو مردووانە بەرزەبێ هەڵساون و زیندوون و بە زمانی حاڵ دەڵێن:

(ئێمە مردوو نین و.. ناشمرین و.. بەم زووانە بە یەکتر شاد دەبینەوە)!

بەڵێ، هەروەك چاك بوونەوەی ناڵەكە - پاش ئومێدبڕین لە چاك بوونەوەی - تابڵێی خۆشی و شادیی بەخشی، ئەمەش بە هەمان جۆرە و دڵنیامان دەكات لەوەی كە هەروەك ئیمان لەم دنیایەدا بەم چەشنە خۆشی و شادی دەبەخشێت، ئەوەش دەچەسپێنێت كە حەقیقەتی ئەم ئیمانە بریتی یە لە "تۆو"ێكی مەعنەوی و زیندووی ئەوتۆ كە ئەگەر ببێت بە تۆوێكی بەرجەستە ئەوا بەهەشتێكی تایبەتی بۆ هەموو ئیماندارێك سەوز دەكات و دەبێت بە "درەختی توبا"ی ئەو تۆوە.

وام بەو شەیتانە ئادەمی یە سەرسەختە وت. بەڵام ئەو گەڕایەوە و، وتی:

- (وازمان لێ بهێنە! با هیچ نەبێ وەك ئاژەڵ بژیین و، ئاگامان لەم كاروبار و وردەكاری یەی ڕووداوەكانی دەوروبەرمان نەبێت و، ژیانمان بە گاڵتە و یاری و ڕابواردن بەسەر بەرین)!

لە وەڵامدا پێم وت:

- تۆ نە بە ئاژەڵ دەبیت و، نە لەگەڵ ئاژەڵیشدا بەراورد دەكرێیت! چونكە ئاژەڵ "ڕابوردوو" و "داهاتوو"ی نی یە تاكو بیریان لێ بكاتەوە، لەبەر ئەوەی كە نە هەست بە ئازار و خەفەتی ڕابوردوو دەكات و، نە لە ترس و دڵتەنگیشدایە بۆ دواڕۆژ. كەواتە هەموو كاتێك هەست بە لەزەتی تەواوی خۆی دەكات. تەنانەت ئەو ئاژەڵەش كە بۆ سەربڕین ئامادە كراوە، تەنها ئازاری چەقۆ نەبێت لە دەمی سەربڕینیدا هەست بە هیچ ئازارێكی تر ناكات. خۆ ئاشكرایە كە بە تەواوبوونی سەربڕینەكەی، ئەو ئازارەش تەواو دەبێت.

ئنجا بزانە كە: بەزەیی و میهرەبانیی خوای گەورە لە شاردنەوەی غەیب و داپۆشینی بەڵا و موسیبەتەكاندا، چەندە بە جوانی دەردەكەوێت، بە تایبەت لە ئاژەڵ و گیاندارە بەستەزمانەكاندا.

بەڵام تۆی "مرۆڤ" وەك ئاژەڵ نیت. چونكە بە حوكمی ئەو عەقڵەی لە تۆدا هەیە و ئاژەڵ لێی بێ بەشە، هەندێك لە "ڕابوردوو" و "ئاینده"ت بە

پەنهانی نەماوەتەوە و، نیعمەتی ئاسوودەیی و داپۆشینی پەردەی غەیب کە خوا بە ئاژەڵانی داوە، بە تۆی نەداوە. ئەوەتا داخ و حەسرەتەکانی نەمانی "ڕابوردوو" هاودەم لەگەڵ جۆرە جیاجیاکانی جودایی و مەترسی‌یەکانی "ئاینده"ت هەموو تام و لەزەتێکی جوزئی و کەمت دەدەن بە بادا و، لە چەشتنی تام و لەزەتی دنیادا پلەیەکی گەلێ نزمترت لە هی ئاژەڵ بۆ دادەنێن!

جا مادەم ڕاستی وایە، ئەوا یان دەبێ (بە تەواوی) دەست لە هەست و ژیریت دابشۆیت و وازی لێ بهێنیت و خۆت بە "ئاژەڵ" بژمێریت، تاکو لەو ئازارانە ڕزگارت ببێت.. یان بە نووری ئیمان تاریکیی عەقڵت ڕووناك بکەیتەوە و، گوێ بۆ دەنگی زوڵاڵی قورئانی پیرۆز ڕابگریت، تاکو پلەت لە هی ئاژەڵ بەرزتر بکەیتەوە و، بەم جۆرە هەر لەم دنیا فانی‌یەدا سوود لە تام و چێژی پاك و بێگەرد وەربگریت.

بەم بەڵگەیە بێدەنگم کرد و بەزاندم. بەڵام بیانووی تری دۆزی‌یەوە و وتی:

- (خۆ هیچ نەبێ بەلای کەمەوە وەك مولحیدانی ناو بیانی‌یەکان دەتوانین بژیین)!

وتم:

- ناتوانیت تەنانەت وەك ئەوانیش بژییت! چونکە ئەوان ئەگەر ئینکاریی تەنها یەك پێغەمبەر بکەن، ئەوا ئیمانیان بە پێغەمبەرانی تر هەیە. تەنانەت گەر هیچ کام لە پێغەمبەران نەناسن، لەوانەیە ئیمانیان بە خوا ببێت. ئەگەر ئەم ئیمانەشیان نەبێت، خاوەنی هێندە ڕەوشتی بەرزی مرۆڤانەن کە بیانگەیەنێتە کەمالاتی مرۆڤانە.

بەڵام ئەگەر موسڵمانێك ئینکاریی دواهەمین پێغەمبەر ﷺ بکات و، سەرپێچی بەرامبەر بەو ئایینە ڕاست و ڕەوایە بنوێنێت کە هیچ ئایینێکی تری لە ڕاستی و فراوانیدا پێ ناگاتەوە، ئەوا لە بازنەی ڕێنمایی ئەو ئایینە

دەرچووە و لە ئەستۆی خۆیی داماڵیوە. کەواتە بە هیچ پێغەمبەرێکی تر ڕازی نابێت، تەنانەت قبووڵی "باوەڕ بە خوا"یش ناکات، چونکە تەنها لە ڕێگای ئەم ئایینەوە پێغەمبەرانی تری ناسیوە و، بەهۆی ڕێنمایی و بانگەوازی پێغەمبەریشەوە ﷺ ڕێگای باوەڕ بە خوای دۆزیوەتەوە. کەواتە بێ باوەڕبوون بەم پێغەمبەرە ﷺ باوەڕی بە هیچ شتێکی تر لەوانەی باس کران لە دڵدا نامێنێت..

هەر لەبەر ئەوەشە کە هەر لە دێر زەمانەوە خەڵکی پۆل پۆل هاتوونەتە ناو ئایینی ئیسلامەوە. بەڵام هەرگیز بە پێچەوانەوە ڕووی نەداوە کە موسڵمانێك بووبێت بە "جوولەکە"یەکی ڕاستەقینە یان "مەجووسی" یان "دیان"، بەڵام دوور نییە ببێت بە مولحیدێکی بەدڕەوشتی زیانبەخش بە وڵات و هاوولاتییان!

بەم چەشنە بەزاندم و بە بەڵگە بۆم چەسپاند کە ناتوانێت تەنانەت وەك مولحیدانی ناو بیانییەکانیش بژی و وەك ئەوان بکات. ئیتر کە هیچ پاڵپشتێکی بۆ نەمایەوە، پشتی هەڵکرد و بەرەو دۆزەخ کەوتە ڕێ!

دەسا ئەی ئەو هاوڕێیانەی کە لەم قوتابخانە یووسفییەدا کۆبوونەتەوە!

مادەم ڕاستی ئەمەیە کە باسمان کرد..

مادەم پەیامەکانی نووریش وا بیست ساڵی ڕەبەقە و تا ئێستاش بەردەوام کەللەڕەقیی سەرکەشان دەشکێنێت و بەرەو ئیمان دەیانهێنێت، ئەوا دەبێ ئێمەمانان پتر دەست بە ئیمانەکەمانەوە بگرین و، لەسەر ئەو شاڕێگا و ڕاستەشەقامە بەردەوام بین کە سوودی تەواوی بۆ دنیا و ئایندە و وڵات و نەتەوەمان هەیە.

ئەمەش بەوە دەبێت کە کاتەکانمان بە شتی بێ سوود و خەیاڵ و ئاواتی پووچ و بێهوودەوە لەناو نەبەین، بەڵکو بە خوێندنەوەی ئەو سوورەتانەی

قورئانی پیرۆز کە دەیانزانین ئەو کاتانەمان زیندوو بکەینەوە و، شەو و ڕۆژ بە قورئان خوێندنەوە خەریك بین و، لای ئەو برایانەش کە شارەزای قورئانن واتاکانی فێر ببین و، هەرچی نوێژی فەرزمان فەوتاوە بیانگێڕینەوە و، ڕەوشتە بەرزەکانیش لە یەکترەوە فێر ببین. بەشکو خواوەند لە پاداشتی ئەمەدا بمانکات بەو کەسانەی کە لەم بەندیخانەیەدا نەمام دەنێژن و ئەو نەمامانەش لە دواییدا دەبن بە چەند درەختێکی بەرداری سوودبەخش.

دەبێ بە ڕاستی تێبکۆشین تاکو بەرپرسانی بەندیخانە ببن بە چەند مامۆستا و ڕابەرێکی ئەوتۆ کە لەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا پیاوان بۆ بەهەشت پەروەردە بکەن و، ببن بە چەند سەرپەرشتیارێکی ڕێکوپێك و باش کە بە جوانی ئەرکی ڕێنمایی کردنی بەندکراوان بگرنە ئەستۆ، نەك بە چەوسێنەر و سزادەری پیاوکوژ و تاوانکاران.

* * *

## مەسەلەی چوارەم:

### بەجێهێنانی هەندێ ئەرك لە هەندێکی تر پێویست ترە

هەروەك لە "ڕابەری لاوان"دا ڕوون کراوەتەوە، جارێکیان ئەو برایانەی خزمەتیان دەکردم لێیان پرسیم:

- ئەم جەنگەی ئێستا کە لە نێوان ئەڵمان و هاوپەیمانەکاندایە (جەنگی جیهانیی دووهەم) گۆی زەویی سەرقاڵ کردووە و، سەرنجی خەڵکیی ڕاکێشاوە و خستوونیەتە دڵە ڕاوکێ و نیگەرانی‌یەوە. لە هەمان کاتیشدا پەیوەندیی بە چارەنووسی جیهانی ئیسلامەوە هەیە.. سەرەڕای ئەوەی کە پەنجا ڕۆژە - بگرە وا حەوت ساڵە[1] - ئەم جەنگە بەردەوامە کەچی نابینین هیچ پرسیارێکی لەبارەوە بکەیت یان گوێی پێ بدەیت، لە کاتێکدا کە دەبینین چەندین کەسی ئاییندار و زانا واز لە مزگەوت و نوێژی جەماعەت دەهێنن و، بە پەلە بۆ گوێ ڕاگرتن لە ڕادیۆ ڕادەکەن!

جا ئایا هیچ کێشەیەك هەیە لەمە گرنگتر بێت تاکو سەرقاڵت بکات؟ یان خۆخەریك کردن بەم کارەوە زیانی تێدایە؟

منیش لە وەڵامدا پێم وتن:

- سەرمایەی تەمەن زۆر کەمە و، لە هەمان کاتیشدا ئەو ئەرك و واجبە گرنگانەی کە پێمان سپێرراون گەلێ زۆرن. ئەم ئەرك و واجبانە وەکو چەند

---

(١) ئەم ڕستە زیاد کراوەی دانەر هی ساڵی (١٩٤٦ز)یە. (وەرگێڕ)

بازنەیەكی هاوچەقی یەك لەناو یەك وان و هەموویان یەك جەمسەریان هەیە، ئەویش مرۆڤە.

هەر لە بازنەی: دڵ و، گەدە و، لەش و، ماڵ و، گەڕەك و، شار و، وڵات و، گۆی زەوی و، مرۆڤایەتی‌یەوە، تا دەگاتە بازنەی هەموو زیندەوەران و، جیهان بە گشتی، چەند بازنەیەكن لەناو یەكتریدا..

مرۆڤیش لە هەموو یەكێكی ئەو بازنانەدا جۆرە كارمەندی و فەرمانبەری‌یەكی هەیە پێویستە ئەنجامی بدات. دەبێ بیشزانین كە گەورەترین ئەرك و فەرمانبەری، بەڵكو بەردەوامترینیان سەبارەت بە مرۆڤەوە لە بچووكترین و نزیكترین بازنەدایە، بەڵام بچووكترین ئەرك و فەرمانبەری لە گەورەترین و دوورترین بازنەدایە!

كەواتە بەم پێودانگە، دەكرێ ئەرك و فەرمانبەری‌یەكان لەگەڵ بازنەكاندا پێچەوانەی یەكتری بن؛ واتە هەتا بازنەكە نزیكتر و بچووكتر بێت ئەرك و فەرمانبەری‌یەكە گەورەتر دەبێت و، هەتا بازنەكە گەورە و دوور بێت ئەرك و فەرمانبەری‌یەكەش بایەخی كەمتر دەبێتەوە..

بەڵام لەبەر ئەوەی بازنە هەرە گەورەكە لەخشتەبەر و سەرنج ڕاكێشە، ئەوا مرۆڤ بە چەند كاروبارێكی ئەوتۆوە سەرقاڵ دەكات كە سەبارەت بەو هیچ پێویست نین و، بیری مرۆڤ بۆ لای چەند ئیشێك دەبات كە پەیوەندیی پێیانەوە نی‌یە. بەم جۆرە وا بەم بازنەیەوە سەرگەرم دەبێت كە وای لێ دەكات بە جارێ هەموو ئەرك و فەرمانبەری‌یە پێویستەكانی خۆی لە بازنە نزیكەكەی یەكەمدا پشتگوێ بخات.

دیارە بەم كارەش ئەم مرۆڤە هەموو سەرمایەی تەمەنی خۆی لەناودەبات و ژیانیشی بە خۆڕایی لەدەست دەردەچێت.. جگە لەوەی كە جاری وا دەبێت لە ئەنجامی ئەوەی بەوپەڕی شەوقەوە بە دوای دەنگوباسی جەنگدا دەگەڕێت،

لە دڵەوە لایەنی یەکێك لەو دوو بەرەیەی جەنگ دەگرێت، ئنجا هەست بە نارەزایی و ئینکاری کردنی ئەو ستەمانە ناکات کە ئەو لایەنە ئەنجامیان دەدات، بەڵکو دڵی پێیان خۆش دەبێت. دیارە بەمەش دەبێت بە هاوبەشی ستەمکارییەکانی ئەو لایەنە!

وەڵامی خاڵی یەکەمی پرسیارەکەش بەم جۆرەیە:

هەموو مرۆڤێك - بە تایبەتی موسڵمان - کێشەیەکی گرنگ و ڕووداوێکی سامناکی لە بەردەمدایە، زۆر لەو ململانێ و جەنگەی کە لە نێوان دەوڵەتە گەورەکاندا بۆ مەبەستی ژێردەست خستنی گۆی زەوی ڕوودەدات، گەورەترە. ئەو کێشەیە هێندە گرنگە کە ئەگەر مرۆڤی ژیر هێز و سامانی ئینگلیز و ئەڵمانی ببێت، بێ سێ و دوو کردن، لە پێناوی بردنەوەی ئەو کێشەیەدا بەختی دەکات.

ئەو کێشەیە بریتی‌یە لەوەی کە سەد هەزار لە مرۆڤە هەڵبژاردەکان ڕایانگەیاندووە و، ئەندازەیەکی لەژمارەبەدەریش لە ئەستێرە و ڕابەرانی گرۆی مرۆڤایەتی ئاڵاکەیان هەڵگرتووە و، لەمەشدا پشتیان بە بەڵێن و پەیمانەکانی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان بەستووە، تەنانەت هەندێکیشیان بە چاوی خۆیان بینیویانە..

ئەو کێشەیە کێشەی چارەنووس و پاشەڕۆژی مرۆڤە، کە بریتی‌یە لەوەی:

مرۆڤ، یان بەهۆی ئیمانەوە موڵکێکی گەورەی هەمیشەیی و خانووبەرەی پاکی لە چەندین بەهەشتی ئەوتۆدا دەست بکەوێت کە بە ئەندازەی زەوی و ئاسمانەکان بەرین.. یان لەبەر نەبوونی ئیمان هەموو ئەمانەی لەدەست دەربچێت!

هەر کەسێك ئیمان شایەتیی بۆ نەدات و بە ڕاستی چاودێریی ئیمانەکەی نەکات، کێشەکەی دۆڕاندووە و گرنگترین زیانی لێ کەوتووە.

لەم سەردەمەی خۆماندا بەشێكی زۆر لەو كەسانەی كە دووچاری تاعوونی ماددییەت بوون، ئەم كێشەیەیان دۆڕاندووە. بە ڕادەیەك كە یەكێك لە زانایانی ئەهلی كەشف بۆی دەركەوت و ڕایگەیاند كە لە نێوان چل كەسدا (هی شوێنێكی تایبەتی) چەند كەسێكی كەم لە سەرەمەرگدا بە ئیمانەوە دەڕۆن و بە "چاكە" كۆتایی بە ژیانیان دێت، بەلاّم ئەوانی تر هەموویان تیا دەچن!

ئەگەر یەكێك لەوانە هەموو دەستەلاّت و موڵك و ئارایشتكاریی دنیای لە بریی بردنەوەی ئەو كێشەیە پێ بدرێت، ئایا هێشتا بە ئەندازەی ئەوە دەبێت كە لە كیسی چووە؟

یان ئایا جێی ئەوەی بۆ دەگرێتەوە كە لە دەستی داوە؟

دیارە نەخێر!

لەبەر ئەوە، ئێمەی قوتابیانی نوور بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەزانین كە:

وازهێنان لە چەند خزمەتگوزارییەكی ئەوتۆ كە ئەو كێشەیەمان بۆ دەباتەوە و، پشتگوێ خستنی كاروباری پارێزەری ئەو دەعوا و كێشەیە[1] كە لە سەدا نەوەد ئەو كێشەیە دەپارێزێت و، خۆ خەریك كردن بە چەند كاروبارێكی دەرەكی و، بایەخدان بە شتی بێ بایەخ - وەك بڵێی دنیا هەمیشەیی بێت - ئەمە لە ڕاستیدا بە نەفامی و شێتی دادەنرێت.

ئێمە لەمەدا لەوپەڕی یەقین و دڵنیاییداین.

لەبەر ئەوە، ئەگەر هەركام لە ئێمە چەندین ئەوەندەی ئێستای خۆی خاوەنی ژیری و وردەكاری بێت، هەر هەمووی لە پێناوی بردنەوەی ئەو كێشەیەدا بەخت دەكات.

ئەی ئەو برایانەی كە تازە لەم قوتابخانە یووسفییەدا بوون بە برامان!

(١) مەبەست لەو وەكیلە پەیامەكانی نوورە. (وەرگێڕ)

هێشتا ئێوە وەك برایانی پێشووم کە بەندیخانەیان دیوە، شارەزای "پەیامەکانی نوور" نین..

لەبەر ئەوە، قسەیەك کە چەندین جار وتوومە و دووپاتم کردووەتەوە، وا بە گوێی ئێوەشیدا دەدەم و، ئەو برایانە و هەزاران کەسی تری وەك ئەوانیشی لەسەر دەگرم بە شایەت. کە بریتی‌یە لەوەی:

"پەیامەکانی نوور" ئەو کێشەیەیان دەستی لە سەدا نەوەدی ئەو برایانە خستووە. هەر پەیامەکانی نوور بوون کە لە ماوەی بیست ساڵی ڕابوردوودا بڕوانامەی بردنەوەی ئەو کێشەیەیان - کە بریتی‌یە لە ئیمانی تەحقیقی - دایە دەست بیست هەزار کەس.

ئەمەش شتێکی سەیر نی‌یە، چونکە ئەم پەیامانە لە سەرچاوەی ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆزەوە هەڵقوڵاون و، لە پێشەکیی وەکیل و پارێزەرانی ئەم سەردەمەی ئەو کێشە گرنگەوەن.

وا هەژدە ساڵ ڕابورد و، لەم ماوەیەدا دوژمنان و زەندیقان و ماددی‌یەکان چەندین جۆری فڕوفێڵیان بۆ پێکهێناین و، تا ئێستاش هەر بەردەوامن و، هەندێ فەرمانبەر لە دژمان هان دەدەن و لە پێناوی لەناوبردنماندا بەکاریان دەهێنن، تاکو لە بەندیخانە توندیان کردین، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا کارێکیان نەکردووە شایانی باس بێت، پشت بە خوا ناشتوانن بیکەن..

چونکە ئەوانە نەیانتوانی خۆیان لە قەڵای پۆڵایینی "پەیامەکانی نوور" بدەن و، دەست بۆ ئەو سەد و سی و سێ پەیامە ببەن کە وەك گوللە بە ڕووی ئەواندا دەتەقێنەوە، تەنها دوان سیانێکیان نەبێت.

کەواتە ئەو کەسەی دەیەوێت لەم کێشەیەدا پارێزەرێك بکات بە بریکاری خۆی و بەرگریی لێ بکات، با پشت بەو قەڵایە ببەستێت و خۆی لێ قایم بکات و، لە نوور و ڕووناکی‌یەکەی وەربگرێت.

برایانم!

هیچ خەم و ترسێکتان لە پەیامەکانی نوور نەبێت، پشت بە خوا ئەم پەیامانە لە بەرچاوی خەڵکیدا هەڵناگیرێن و لانابرێن و لە کۆمەڵ ناشاررێنەوە. چونکە بەشەکانی ئەم پەیامانە بەوپەڕی سەربەستیەوە لە ناوەندی پەرلەمان و گەورە پیاوانی دەوڵەتدا دەخوێندرێنەوە و ئەم دەست و ئەو دەست دەکەن.

پشت بە خوا ئەو ڕۆژە دێتە کایەوە کە فەرمانبەر و بەڕێوەبەرە خۆشبەختەکان، پەیامەکانی نوور بەسەر بەندکراواندا، بە وێنەی خۆراك و چارەسەری و دەرمان، دابەش بکەن و، ئەم بەندیخانانە بکەن بە قوتابخانە و مەڵبەندی چاککردن و پەروەردە و ڕێنمایی.

* * *

## مەسەلەی پێنجەم:

**با لاوی‌یەکی هەمیشەیی بەدەست بهێنین**

بێ گومان "لاوی" - وەك لە پەیامی (ڕابەری لاوان)دا باسمان کردووە - دەڕوات و وەك "خۆر" ئاوا دەبێت. چونکە هەروەك پایز و زستان بە دوای هاویندا و، ئێوارە و شەویش بە دوای ڕۆژدا دێت، بە هەمان جۆر و بەپێی هەمان ڕاستی "لاوی"ش دەبێت بە "پیری" و پاشان بە "مردن".

جا ئەگەر "لاو" هەرچی وزە و توانای کاتیی خۆی هەیە لە پێناوی خێر و چاکە و لە بازنەی داوێنپاکی و لەسەر ڕێگای ڕاستدا بەسەر برد، ئەوا هەموو فەرمانە ئاسمانی‌یەکان مژدەی دەستکەوتنی لاوی‌یەکی هەمیشەیی نەبڕاوەی دەدەنێ.

چونکە هەروەك لەوانەیە تووڕەبوونی تەنها یەك "خولەك" پاڵ بە مرۆڤەوە بنێت کەسێك بکوژێت و، بەو هۆیەوە ملیۆنان "خولەك" لە ئازار و ئەشکەنجەی بەندیخانەدا بەسەربەرێت، هەرزەیی و چێژە سەرپێیی و کاتی‌یەکانی "لاوی"ش بە هەمان جۆرە، چونکە ئەگەر لە دەرەوەی بازنەکانی حەڵاڵدا بەکاربهێنرێت، چەندین ئازاری زۆر و قووڵتر هەر لە خودی لەزەتەکەدا دەرخواردی مرۆڤ دەدات، چ جای تۆڵەی ترسناکی دواڕۆژ و، سزای توندوتیژی ناو گۆڕ و، سەرەڕای ئەو ئاخ هەڵکێشانە قووڵانەی کە لە نەمانی خودی تام و چێژەکانەوە سەرهەڵدەدەن و، جگە لەو ئاکامە دنیاییانەش کە لەو تاوان و خراپکاری‌یانەوە پەیدا دەبن.

هەموو لاوێکی ژیر کە ئەو تاقیکردنەوانەی بە خۆیەوە دیبێت، هەر لە خودی ئەو تام و لەزەتانەدا هەست بەو ئازارانەش دەکات. بۆ نموونە:

خۆشەویستیی حەرام، یان عیشقێك کە لە پێناوی حەقدا نەبێت، ئەوەندە ئازاری تێدایە کە لەزەتە کەم و جوزئی‌یەکەی تاڵ دەکەن. یەکێك لەو ئازارانە ئازاری غیرەت و حەسوودی‌یە.. یەکێکی تریان ئازاری جودایی خۆشەویستە.. یەکێکی تریش خۆشەویستی نەگۆڕینەوەیە لە نێوانی یەکتردا وەکو یەك.. جگە لەمانەش چەندین ئازاری تاڵ و لێڵکەری تر هەن کە ئەو لەزەتە جوزئی‌یە وەکو هەنگوینی ژەهراوی لێ دەکەن.

جا ئەگەر دەتەوێت بزانیت کە هەڵسوکەوتی هەڵەی لاوان و زیادەڕەوی‌یان لە کاروباریاندا، دەبێتە هۆی نەخۆشکەوتنیان، بە ڕادەیەکی وا کە بیانگەیەنێتە خەستەخانەکان، یان گۆڕستانەکان..

ئەگەر دەتەوێت تێبگەیت لەوەی کە لەخۆبایی‌بوون و هەڵەشەیی لاوان بەرەو بەندیخانەکان بەرێیان دەکات..

ئەگەر دەتەوێت بۆت دەربکەوێت کە هەرچی ئازاری مەعنەوی و خەفەتی دەروونی لاوان هەن، کە لە ئەنجامی بەتاڵیی ڕۆح و برسێتیی دڵ و بێ کاریی لەشەوە پەیدا بوون، بەرەو دەرگای مەیخانە و مەلهاکانیان دەبات..

ئەگەر دەتەوێت لەمانە تێبگەیت و بگەیتە ئەم دەرەنجامە، ئەوا فەرموو پرسیار لە خەستەخانە و بەندیخانە و مەیخانە و گۆڕستانەکان بکە!

ئەو کاتە - بێ هیچ گومانێك - گوێت لە دەنگی ئاخ و ناڵە و قوڵپەی گریان و هەنسك و حەسرەتی پەشیمانی دەبێت، زۆربەیان لە زاری چەند لاوێکی سەر لێ شێواو دەردەچن، کە بەهۆی هاندەری ئارەزووەکان و زیادەڕەوی و خراپکاری و هەڵپەکردن بە دوای لەزەتی حەرام و چەپەڵدا، سنووری حەڵاڵیان بەزاندووە و، لە ئەنجامی ئەوەشدا زللەی بەئازار و لێدانی

پڕ لە ئێشیان چەشتووە و، ئێستا بەو شێوەیە دەنگ و گریان و هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە.

بەڵام ئەگەر لاو سەردەمی لاویی لە گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خوادا بەسەر برد و، ڕێی ڕاستی گرتەبەر و لە سەریشی بەردەوام بوو، ئەوا لاوی‌یەکەی خۆی دەکات بە شیرینترین ناز و نیعمەت و، جوانترین بەخششی خوایی و، ڕێگای بۆ کردەوە چاکەکان پێ خۆش دەکات و، لاوی‌یەکی نوێ و هەمیشەیی و جوانی لە قیامەتدا، لە بریی ئەم لاوی‌یە فانی و لەناوچووەی دنیا، پێ بەرهەم دەهێنێت. هەموو کتێب و پەڕاوە ئاسمانی‌یە ڕەوانەکراوەکان، کە لە پێشەکیی هەموویانەوە قورئانی پیرۆز و ئایەتەکانی ئەو قورئانەیە، ئەم مژدەیەمان دەدەنێ.

جا مادەم ڕاستی ئەمەیە کە باسمان کرد..

مادەم مەیدانی حەڵاڵ ئەوەندە بەرین و فراوانە کە بۆ حەوانەوە و خۆشی و ڕابواردن سەروزیادە.

مادەم تەنها یەك لەزەتی حەرام هێندە ئازار دەرخواردی خاوەنەکەی دەدات کە ساڵێك، تەنانەت هەندێ جار دە ساڵ ئەو ئازارە لە بەندیخانەدا درێژە بکێشێت..

مادەم وایە.. ئەوا دەبێ سەردەمی "لاوی" بە دەست و دڵ خاوێنی و، داوێنپاکی و، ڕەوشت و ئاکاری جوان و، گرتنەبەری ڕێگای ڕاست بەسەر ببرێت، بۆ شوکرانەی ئەو نیعمەتە بەلەزەتانەی بۆی کراون بە دیاری. بەڵکو ئەمە لە هەموو شتێك پێویستترە کە لاوان بیکەن و ئەنجامی بدەن.

* * *

## مەسەلەی شەشەم:

**ـــــــــــــــــــــــــ زانستەکان بەدیهێنەرمان پێ دەناسێنن**

**(ئەم مەسەلەیە ئاماژەیەکی کورتە بۆ تەنها یەك بەڵگە لە نێوان هەزاران بەڵگەی گشتیدا سەبارەت بە (ئیمان بە خوا) کە لە زۆر شوێنی تری پەیامەکانی نووردا بە بەڵگەی چەسپێنەرەوە ڕوون کراونەتەوە).**

کۆمەڵێك لە قوتابیانی قۆناغی ئامادەیی لە شاری "قەستەمۆنی"[1] هاتن بۆلام و پێیان وتم:

- (خوای بەدیهێنەرمان پێ بناسێنە، چونکە مامۆستاکانمان باسی خوامان بۆ ناکەن)!

پێم وتن:

- هەریەك لەو زانستانەی دەیانخوێنن، هەمیشە باسی خوا دەکات و بە زمانی تایبەتیی خۆی خواوەندی بەخشندەمان پێ دەناسێنێت. کەواتە ئێوەش لە بریی مامۆستاکان گوێ بۆ زانستەکان ڕابگرن!

❖ بۆ نموونە:

هەروەك هەر شووشە دەرمان و پێکهاتەیەکی کیمیایی ناو دەرمانخانەیەکی گەورە، کە بە چەندین تەرازووی سەرنەکەر و ئەندازەی ورد

---

(١) "قەستەمۆنی" شارێکە دەکەوێتە باکووری تورکیا، لە ساڵی ١٩٣٧ زدا مامۆستا نوورسی بۆ ئەوێ دوور خراوەتەوە و هەتا ساڵی ١٩٤٣ ز تیایدا دەست بەسەر بووە، ئنجا لەم بەرەوارەوە بە بەندکراوی براوە بۆ دادگای گەورەی جەزا لە شاری "دەنیزلی". (وەرگێڕ)

ئاوێتــەی یــەکتر کرایێــن، دەیچەســپێنێت کــە دەرمانگــەرێکی دانــا و کیمیاگەرێکی زانا ئەم کارانەی ئەنجام داوە..

دەرمانخانـەی گـۆی زەویـش، کـە چـوار سـەد هـەزار جـۆری ڕووەك و زیندەوەری زیاتر تێدایە، بە هەمان جۆرە.. چونکـە لـە ڕاستیدا هەریەکە لـەو ڕووەك و زیندەوەرانــە وەك شووشــەیەکی پــڕ لــە پێکــهاتووی ورد و، ئاوێتەکراوێکی زیندەکاری سەرسووڕهێنەر وایە.

جا ئەم دەرمانخانە گەورەیە، خواوەنـدی دانـا و شـکۆمەند پیشـانی هـەموو کەسـێك، تەنانـەت نابینایـانیش، دەدات و، بـە ئـەندازەی پلـەی کـەماڵ و ڕێکوپێکــی و گەورەییەکــەی، بەدیهێنــەری بەخشــندە بــە غــەیری خــۆی دەناسێنێت، بە چەشنی دەرمانخانەکەی بازاڕ، کـە کیمیاگـەر و دروستکەری خۆی ناساند. ئەمەش بەپێی زانستی "پزیشکی" کە خۆتان دەیخوێنن.

❖ نموونەیەکی تر:

هەروەك ئەگەر کارگەیەکی گەورە و نائاسـایی لـە تەنـها ماددەیەکی زۆر ساکار چەندین جۆر کووتاڵی جۆراوجۆر بچنێت و بەرهەمیان بهێنێت، ئـەوا بەم کارەی دەیچەسـپێنێت کـە بێ هیـچ گومـانێك ئـەندازیارێکی میکـانیکیی کارامــە هەیــە ئــەم کارانــە ڕادەپــەڕێنێت. بــەم جــۆرە ئــەو کارگەیــە ئەندازیارەکەمان پێ دەناسێنێت.

ئەم مەکینە هاتوچۆکەر و کارگە خواییەش، کە نـاوی گـۆی زەوییـە، بـە هەمان چەشنە، کە سـەدان هـەزار کارگـەی سـەرەکیی تێدایـە و هەریـەك لـەم کارگـە سـەرەکییانـەش هـەزار کارگـەی وردەکـاری تێدایـە و، هەریەکـەیان - بـێ هیـچ گومـانێك - خــاوەن و بەدیهێنــەری خۆمــان، بــە ئــەندازەی گــەورەیی و کـەماڵی ئـەم کارگـە خواییـە لـەچاو کارگە ئادەمییەکـەدا، پـێ

دەناسێنێت، هەروەك کارگە ئادەمی‌یەکە ئەندازیاری خۆی پێ ناساندین. ئەمەش بەپێی دەستوورەکانی زانستی "میکانیك" کە دەیخوێنن.

❖ نموونەیەکی تر:

هەروەك کۆگا و گەنجینەیەکی گەورەی ئازووقە، کە لە هەموو لایەکەوە هەزار جۆر خواردەمەنیی تێدا ئامادە کرابێت و لەیەك جیا کرابنەوە و هەریەکەیان لە جێگایەکی تایبەتیدا ڕیز کرابن، تێمان دەگەیەنێت کە خاوەن و بەڕێوەبەرێکی هەیە سەرپەرشتیی دەکات..

ئەم گەنجینەی ڕۆزیدانە خواییەش بە هەمان جۆرە..

ئەم گەنجینەیەی کە لە گەشتی یەك ساڵیدا ماوەی بیست و چوار هەزار ساڵ ڕێ بەوپەڕی ڕێکوپێکی دەبڕێت و، سەدان هەزار بەدیهێنراوی لەناودا هەن کە هەریەکەیان پێویستی بە جۆرێك خواردەمەنیی تایبەتی هەیە..

ئەم گەنجینەیەی کە بەسەر هەر چوار وەرزەکەدا تێپەڕ دەبێت و، وەرزی بەهار وەك کاروانێك کە هەزاران جۆر خواردەمەنیی پێ بێت، لەگەڵ خۆیدا بۆ هەموو ئەو هەژارانە دەهێنێت کە لە زستاندا خۆراك و ئازووقەیان لێ بڕاوە..

ئەم گەنجینە خواییە (کە گۆی زەوی‌یە) وەك کەشتی‌یەکی خوایی وایە و هەزاران جۆری کەرەسە و کۆئەندام و قوتووی خواردەمەنیی تێدایە..

ئەم گەنجینە و کۆگا پەروەردگاری‌یە، بەپێی دەستوورەکانی زانستی: (ژیانسازی و بازرگانی) کە ئێوە دەیخوێنن و، بە ئەندازەی گەورەیی خودی گەنجینەکە، خاوەن و کارسازی خۆیمان پیشان دەدات و پێمان دەناسێنێت و لە لامان خۆشەویستی دەکات. هەروەك ئەو گەنجینەیەی کە دەستکردی مرۆڤ بوو، خاوەن و بەڕێوەبەرەکەی خۆی پێ ناساندین.

❖ نموونەیەکی تر:

ئەگەر سوپایەکی گەورە چوارسەد هەزار گەل و نەتەوەی جیاجیای لە ژێر ئاڵاکەی خۆیدا کۆ کردبێتەوە و، هەریەك لەو ڕەگەز و نەتەوانەش خواردەمەنیی لەوانی تر جیاواز بێت و، چەکی هیچیان لە هی تریان نەچێت و، بەرگ و پۆشاك و شێوەی مەشق کردن و جۆری تەعلیمات و ماوەی پشوودانیان لە یەکتر جیا بێت و، پێشەوای ئەو سوپایە، بێ ئەوەی هیچیانی لەبیر بچێتەوە یان سەری لێ تێك بچێت، خۆراك و پۆشاکی جیاجیایان بداتێ..

ئەو سوپایەی بەم جۆرە بێت، دەری دەخات کە: پێشەواکەی کەسێکی بێ وێنە و ناوازەیە..

جا هەروەك ئەم سەربازگە سەرسووڕهێنەرە ئەو پێشەوا ناوازەیەمان بۆ دەردەخات و پێمان دەناسێنێت و، تەنانەت خۆشەویستیشی دەکات لە لامان، سەربازگەی "زەوی"یش بە هەمان جۆرە. چونکە سەربازگەی زەوی لە هەموو بەهارێکدا سەرلەنوێ سوپایەکی خوایی گەورە لە چوارسەد هەزار ڕەگەز و جۆری گەلانی ڕووەك و نەتەوە جیاجیاکانی زیندەوەران پێك دەهێنێت و، هەر جۆرەشیان پۆشاك و، خۆراك و، چەك و، مەشق و، پشووی تایبەتیی خۆی لە لایەن پێشەوایەکی گەورەی تاك و تەنیاوە، بە بێ لەبیرچوونی هیچ کامێکیان، یان لێ تێکچوون، یان سەرگەردان بوون و، بەوپەڕی تەواوی و ڕێکوپێکیشەوە، پێ دەبەخشرێت.

جا بەپێی "زانستە سەربازییەکان" ئەم سەربازگە بەرین و فراوانەی وەرزی بەهار کە بە پانتایی گۆی زەوی بڵاو بووەتەوە، بەڕێوەبەر و پەروەردگار و پێشەوای هەرە مەزن و پیرۆزی خۆی پیشانی هەموو ئەوانە دەدات کە خاوەنی دڵ و دەروون و تێگەیشتن و ژیرین و، بە ئەندازەی پلەی

کەماڵ و گەورەیی ئەم سەربازگەیە، ئەو پەروەردگارەیان پێ دەناسێنێت و، لە ڕێگای تەقدیس و تەسبیح و ڕێزلێنان و سوپاس کردنەوە، لە لایان خۆشەویستی دەکات. وەك سەربازگە ناوبراوە کە ئەمەی سەبارەت بە پێشەواکەی خۆی ئەنجام دا.

❖ نموونەیەکی تر:

وا دابنێ کە ملیۆنان گڵۆپی کارەبا لەناو شارێکی سەرسوورهێنەردا، بە بێ ئەوەی سووتەمەنی‌یان لێ ببڕێت و بکوژێنەوە، هاتوچۆ بکەن.

ئایا ئەم کارە – لەگەڵ دەربڕینی ڕێز و سەرسوورماندا – دەری ناخات کە: ئەندازیارێکی بێ هاوتا و کارەباچی‌یەکی کارامە هەیە، کارگەی کارەباکە و ئەو گڵۆپانەی لەژێر دەستدایە؟

بە هەمان جۆر، گڵۆپی ئەو ئەستێرانەش کە بە بن‌میچی خانەی زەوی‌یەوە شۆڕ بوونەتەوە و، بەپێی گەردووناسیی نوێ هەندێکیان بە هەزاران جار لە گۆی زەوی گەورەترن و، خێراییان لە هی تۆپی تۆپخانەکان زیاترە و، بێ ئەوەی ڕێسای نێوانیان تێك بچێت و لە یەکتر بدەن و، بێ کوژانەوە و تەواوبوونی سووتەمەنی کاردەکەن، وەك لە "گەردووناسی"دا دەیخوێنن.. ئەم ئەستێرانە، بە چەشنێکی ڕووناك، ئاماژە بۆ بەدیهێنەری خۆیان دەکەن.

بۆ نموونە: "خۆر" کە یەك ملیۆن جار لە زەویی خۆمان گەورەترە و یەك ملیۆن سالیش لە زەوی کۆنترە، یەکێکە لەو گڵۆپە داگیرساوە هەمیشەییانەی میوانخانەی خواوەندی میهرەبان. جا بۆ ئەوەی هەمیشە دابگرسێت و گڕ بگرێ و سووتەمەنیی لێ نەبڕێت، هەموو ڕۆژێك پێویستیی بە ئەندازەی دەریاکانی زەوی سووتەمەنی و، چیاکانی زەوی خەڵووز و،

چەندین ئەوەندەی قەبارەی زەویش دار دەبێت، تاکو ئەو بەردەوامی‌یەی بۆ بڕەخسێت..

کەچی ئەو توانستەی کە "خۆر" و هەموو ئەستێرەکانی تری هاوچەشنی خۆر دادەگرسێنێت، بە بێ هیچ سووتەمەنی و خەڵووز و ڕۆنێك ئەم کارە دەکات و نایەڵێت بیشکوژێتەوە و، بە خێراییەکی یەکجار گەورە و بێ لەیەکدان لە شوێنی خۆیاندا دەیانسووڕێنێت. بێ گومان ئەو توانستەی کە ئەم کارە ڕایی دەکات، توانستێکی بێ کۆتایی و دەستەڵاتێکی تابڵێی گەورەی بێ سنوورە.

کەواتە ئەم بوونەوەرە مەزنە و هەرچی گڵۆپ و چرای ڕووناکی تێدایە و پیایدا شۆڕ کراونەتەوە، بە جوانی و بەپێی دەستوورەکانی زانستی "کارەبا" - کە خوێندووتانە یان لەمەولا دەیخوێنن - پادشا و دەستەڵاتداری ئەم پیشانگا و فیستیڤاڵە گەورەیە دەردەخات و، ڕووناککەرەوە و کارساز و بەدیهێنەری خاوەن شکۆی خۆی، بە شایەتیی هەموو ئەستێرە درەخشانەکان بە هەموان دەناسێنێت و، لە ڕێگای سوپاسگوزاری و تەقدیس کردنەوە لە لایان خۆشەویستی دەکات، تەنانەت بۆ پەرستنیشی هانیان دەدات.

❖ نموونەیەکی تر:

ئەگەر کتێبێك هەبێت لە هەموو دێڕێکیدا کتێبێك بە خەتێکی ورد و، لە هەموو وشەیەکیدا سوورەتێکی قورئانی تێدا نووسرابێت و، هەریەك لەو مەسەلە و بابەتانەش کە لێیان دەدوێت ورد و پڕ واتا بن و پشتی یەکتری بگرن، گەر کتێبێکی وا ببێت، ئەوا ئەو کتێبە، بێ هیچ گومانێك، کارامەیی لەڕادەبەدەری نووسەرەکەی و توانستی تەواوی دانەرەکەی دەردەخات..

واتە ئەم جۆرە کتێبە وەك ڕووناکیی خۆر نووسەرەکەی بە خەڵکی دەناسێنێت و کەماڵی توانستی ئەو دەردەخات و، بە چەشنێکی وا ڕێز و

تەقدیری سەیرکەرانی ڕادەکێشێت کە یەکسەر لەبەر خۆیانەوە بڵێن: "تبارك الله، سبحان الله، ما شاء الله".

کتێبی مەزن و گەورەی ئەم گەردوونەش وایە، کە تەنها لە یەك لاپەڕەیدا - کە گۆی زەوی‌یە - و لە یەك مەلزەمەیدا - کە وەرزی بەهارە - سێ سەد هەزار کتێبی جیاجیا، کە ڕووەك و زیندەوەرانن، دەنووسرێن و، هەریەکەیان وەك کتێبێك وان. هەموو ئەمانەش پێکەوە و بە بێ تێکەڵبوون و هەڵە و لەبیرچوونەوە و بەوپەڕی ڕێکوپێکی‌یەوە، دەنووسرێن. تەنانەت لە تەنها وشەیەکیدا (وەك درەخت) پارچە شیعرێکی تەواوەتی و، لە یەك دانە نوختەیدا (وەك تۆو) پێڕستی کتێبێکی تەواو دەنووسرێت.

جا هەروەك ئەمە شتێکە لەبەرچاوماندایە و بێ هیچ گومانێك پیشانمان دەدات کە لە پشتی ئەم نووسینانەوە قەڵەمێکی کارامە هەیە دەیاننووسێت.. ئەوا دەتوانن بۆ خۆتان ئەوە لێك بدەنەوە کە ئایا مەودای بەڵگەی کتێبی گەورە و مەزنی گەردوون، کە لە هەموو وشەیەکیدا چەندین واتا و دانایی تێدایە و.. مەودای بەڵگەی ئەم قورئانە گەورە بەرجەستەیە - کە جیهانە - بزانن چەندەیە و چۆن دەبێت بە بەڵگە لەسەر خواوەندی نووسەری خۆی، هەروەك ئەو کتێبەی لە نموونەکەدا باس کرا، بوو بە بەڵگە لەسەر نووسەرەکەی!

ئەمەش بەپێی داخوازیی (زانستی حیکمەتی شتان) و (هونەری خوێندنەوە و نووسین) کە دەیانخوێنن و، بە تەرازوویەکی گەورەتر و ڕوانینێکی فراوانتر بۆ ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوون، دەردەکەوێت..

تەنانەت ئەو کاتە تێدەگەن کە چۆن ئەم کتێبە گەورەیەی گەردوون بە "الله أکبر"کردن خوای بەدیهێنەری خۆی دەناسێنێت و، بە "سبحان الله"

تەقدیسی ئەو خوایەمان فێر دەکات و، بە سوپاسگوزاریی: "الحمـد لله"ش ئەو خواوەندەمان لە لا خۆشەویست دەکات!

بەم جۆرە و بەپێی ئەوانەی باسمان کردن، هەریەکە لەو زانستە لەژمارەبەدەر و زۆرانە، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری شکۆمەندی بوونەوەر و، خوای گەورەمان بە ناوە جوانەکانی و کەماڵات و سیفەتە بەرزەکانی پێ دەناسێنێت..

ئەمەش بەهۆی ئەو تەرازووە فراوان و، ئاوێنە تایبەتی و، چاوە تیژ و بینەر و، ڕوانینە پڕ لە پەندانەی کە لەناو هەریەك لەو زانستانەدا هەن.

بەو قوتابی‌یە لاوانەم وت:

حیکمەتی دووپات بوونەوەکانی قورئانی پیرۆز، وەك: ﴿خلقَ السموات والأرضَ﴾ و ﴿ربُّ السمواتِ والأرض﴾ لە پێناوی ڕێنمایی کردنی خەڵکیدایە بۆ ئەو ڕاستی‌یەی کە باسمان کرد. هەروەها بۆ ئەوەیە کە ئەم بەڵگە بەهێز و ڕووناکەی "تەوحید"مان فێر بکات و بەدیهێنەری مەزنمان پێ بناسێنێت.

ئەوانیش وتیان:

(سوپاسی بێ سنوور پێشکەشی پەروەردگاری بەدیهێنەرمان بێت، لەسەر ئەم وانەیەی کە لە ڕاستیدا حەقیقەتێکی گەلێ بەرزە، خوات لێ ڕازی بێت و پاداشتی چاکەت بداتەوە).

ئنجا پێم وتن:

مرۆڤ مەکینەیەکی زیندەکارە، هەزاران جۆر ئازار و هەزاران جۆر تام و لەزەت لە ژیاندا دەچێژێت..

ئەم مرۆڤە هەروەك لەوپەڕی دەستەوسانی و کۆڵەواریدایە، لە هەمان کاتیشدا ئەوەندە دوژمنی ماددی و مەعنەویی هەیە کە لە ژمارە نایەن..

هەرچەند لەوپەڕی هەژاریدایە، ئەوەندە ئارەزووی دیار و نادیاریشی هەیە کە لە باس کردن نایەن..

کەواتە مرۆڤ بەدیهێنراوێکی ئەوەندە هەژارە کە هەمیشە زللەی نەمان و جودایی دەخوات. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، هەرکات بەهۆی پەرستش و ئیمانەوە پشت بە خواوەند و پادشای شکۆمەندی خۆی ببەستێ، ئەوا پاڵپشتێکی گەورە و بەهێزی ئەوتۆی دەست دەکەوێت کە بتوانێت لە دەست هەموو دوژمنانی ڕزگاری ببێت و، یارمەتی‌یەکی وای دەستگیر دەبێت کە بۆ بەدەستهێنانی ئاواتەکانی پشتی پێ ببەستێت.

چونکە هەروەك مرۆڤ نیسبەت و پەیوەندیی لەگەڵ کەسانی لە خۆی گەورەتردا هەیە و بەم پەیوەندی و نیسبەتبوونەش بۆ لای گەورەکەی و ڕێزی لای ئەو، شانازی دەکات..

هەر بەم جۆرەش نیسبەت پەیدا کردنی مرۆڤ بەهۆی ئیمانەوە لەگەڵ ئەو خواوەندە بەتوانایەدا کە خاوەنی توانستێکی بێسنوورە و، ئەو پادشا بە بەزەییەی کە میهرەبانی‌یەکی فراوانی هەیە و، پەرستنی لە ڕێی گوێڕایەڵی و شوکرانەبژێری کردنیەوە.. ئەم کارە وا لە (مردن) دەکات، کە خۆی لە خۆیدا ئیعدامێکی هەمیشەییە، بۆ ئەو ئیماندارە ببێت بە بلیتی سەفەر و پشوو وەرگرتن بۆ ڕۆشتن بەرەو جیهانی هەمیشەیی!

خۆتان دەتوانن ئەندازەی ئەوە لێك بدەنەوە، کە ئەم مرۆڤە لە بەردەم گەورەکەی خۆیدا دەبێ چەندە لەزەتی شیرینی پەرستن بچێژێت و، چەندە سوپاسگوزاری ئەو ئیمانە بێت کە لە دڵدا هەستی پێ دەکات و، چەندە بە نووری ئیسلام بەختەوەر بێت و، شانازی بە خوای گەورە و بەتوانا و میهرەبانی خۆی بکات و هەردەم لە شوکرانەبژێریی نیعمەتی ئیمان و ئیسلامدا بێت.

هەروەك ئەمەم بە برا قوتابی‌یەکانم وت، هەروەها بە بەندکراوانیشی دەڵێم:

ئەوەی خوا بناسێت و گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی بکات، با لە بەندیخانەشدا بێت هەر بەختەوەرە. ئەو کەسەش لە خوا بێ‌ئاگا بێت و خوای لە یاد چووبێت، با لە کۆشك و تەلاریشدا بژی، هەر بەدبەخت و سەر لێ شێواوە!

ڕۆژێکیان ستەم لێکراوێك لەو کاتەدا کە بەوپەڕی شادمانی‌یەوە بە داری سێدارەکەیدا سەردەکەوت، ڕووی کردە ستەمکارانی و بە دەنگی بەرز و زوڵاڵ پێی وتن:

- (من لەناوناچم و بەرەو نەمان ناڕۆم، بەڵکو لە بەندیخانەی دنیا دەرباز دەبم و بەرەو بەختەوەریی هەمیشەیی دەڕۆم.. بەڵام دەبینم ئێوە فەرمانی لەناوچوونی هەمیشەییتان بۆ دەرچووە، چونکە وا گومان دەبەن کە مردن نەمان و لەناوچوونە. کەواتە من تۆڵەی خۆمم لێ سەندوونەتەوە)!

ئەمەی وت و، لەگەڵ دووپاتکردنەوەی: "لا إلـه إلا الله"دا، بە چاوی ڕوون و ڕووی گەشەوە گیانی سپارد!

﴿سبحانك لا علم لنا إِلا ما علّمتنا إِنك أَنت العليم الحكيم﴾.

* * *

## مەسەلەی حەوتەم:

**شارەزای ڕێی قیامەتمان بکە**

(بەروبوومێکە ڕۆژێکی هەینیی ڕۆژگارانی بەندیخانەی دەنیزلی بەرهەمی هێنا)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وما أَمْرُ السَّاعةِ إلاّ كَلَمحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَب﴾ (النحل:٧٧).

﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ (لقمان:٢٨).

﴿فَانْظُرْ إِلى آثَارِ رَحْمَتِ الله كَيْفَ يُحْي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِها إنَّ ذلِكَ لَمُحْي الْمَوْتى وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير﴾ (الروم:٥٠).

ڕۆژێکیان لە شاری "قەستەمۆنی" لەسەر زمانی ئەو زانستانەی کە لە قوتابخانەکاندا دەخوێندرێن، دەرسێکم بە هەندێ قوتابیی ئامادەیی وت، کە هاتن پرسیاریان لێ کردم و، وتیان: (خواوەندی بەدیهێنەرمان پێ بناسێنە). وەك لە مەسەلەی شەشەمی پێشوودا باس کرا.

هەندێ لەو بەندکراوانەی کە لە بەندیخانەی "دەنیزلی" لەگەڵ مندا بەندکرابوون و توانییان پەیوەندیم پێوە بکەن، خوێندبوویانەوە و، ئاسوودەیی دەروون و قەناعەتی تەواویان لە خوێندنەوەیدا دەست کەوتبوو،

بە ڕادەیەکی وا کە هەستیان بە شەوق و تاسەیەکی زۆر بۆ دواڕۆژ دەکرد. لەبەر ئەوە، پێیان وتم:

(قیامەتیشمان پێ بناسێنە، بە چەشنێ کە ئیتر نە دەروونی بەدخوازی خۆمان و نە شەیتانەکانی سەردەم نەتوانن لە خشتەمان بەن و بمانگەیەننە ئەم جۆرە بەندیخانانە).

منیش لەسەر داخوازی ئەوان و، بۆ نەهێشتنی پێویستیی قوتابیانی نوور لە بەندیخانەی دەنیزلیدا و، لەبەر ئەو ئارەزووە بەتینەی ئەو کەسانەی کە مەسەلەی شەشەمیان خوێندبووەوە، بە پێویستم زانی پوختەیەکی کورت لە بارەی ئەم پایە ئیمانییە کە بریتییە لە "ئیمان بە دواڕۆژ" ڕوون بکەمەوە. وا ئەم باسە لە پەیامەکانی نوورەوە بە پوختی دەهێنم و دەڵێم:

هەروەك لە مەسەلەی شەشەمدا لە بارەی بەدیهێنەرمانەوە پرسیارمان لە زەوی و ئاسمانەکان کرد و، ئەوانیش لەسەر زمانی زانستەکانی سەردەم، بە جۆرێکی ڕوون و ئاشکرا خوایان پێ ناساندین و وەڵامی پرسیارەکەیان دایەوە.. وا بۆ ئەم باسەش لە پێشدا پرسیاری دواڕۆژ لە پەروەردگاری خۆمان دەکەین، کە بەوپەڕی دڵنیاییەوە ناسیمان، ئنجا لە پێغەمبەری گەورەمان ﷺ ئنجا لە قورئانی پیرۆز و پاشان لە هەموو پێغەمبەرەکانی تر و کتێبە پیرۆزەکان و مەلائیکەت و بوونەوەران.

❐ وا ئێستا لە یەکەم پلەداین؛ لە بارەی ئاخیرەتەوە پرسیار لە خواوەندی گەورەمان دەکەین. خواوەندیش لە ڕێی هەموو ئەو فەرمانانەوە کە بۆ پێغەمبەرانی - درووودیان لەسەر بێت- ناردوون و، بەهۆی هەموو ناوە جوانەکانی خۆی و سیفەتە گەورەکانیەوە، وەڵامان دەداتەوە و دەفەرموێ:

(ئاخیرەت شتێکی بێ گومانە و ئێوەی بۆ لا دەبرێن).

جا لەبەر ئەوەی پەیامی حەشر(وتەی دەهەم) بە دوازدە ڕاستیی ڕوون و بێ گومان "قیامەت"ی چەسپاند و، بە بەڵگەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە

ئاخیرەتی ڕوون کردەوە، ئەوا لێرەدا بە کورتی ئاماژە بۆ ئەو بەڵگانە دەکەین و، واز لە ڕوونکردنەوەکەی ئەویێ دەهێنین بۆ ئەوەی دەیەوێت.

□ بەڵێ، هیچ پادشایەکی گەورە نیی‌یە کە "پاداشت" بۆ گوێڕایەڵان و "تۆڵە"ش بۆ یاخی‌بووان دانەنێت..

کەواتە پادشای هەمیشەیی کە لەوپەڕی بەرزیی پەروەردگاریی ڕەهادایە، پاداشت بۆ ئەوانە دادەنێت کە بەهۆی ئیمانەوە پەیوەندی‌یان لەگەڵدا هەیە و لە ڕێی گوێڕایەڵی کردنەوە خۆیان تەسلیم کردووە.. تۆڵەش بۆ ئەوانە دادەنێت کە لە ڕێی کوفر و یاخی‌بوونەوە ئینکاری عیززەت و گەورەیی ئەو دەکەن. دیارە ئەو پاداشتە لەگەڵ میهرەبانی و جوانیی ئەودا شیاوە و، ئەو تۆڵەیەش لەگەڵ عیززەت و شکۆیدا گونجاوە.

بەم جۆرە، دوو ناوی: "السلطان الدیان"، "رب العالمین" وەڵامی پرسیارەکەمان سەبارەت بە قیامەتەوە دەدەنەوە..

□ پاشان ئێمە بە جۆرێکی ڕوونی وەك ڕووناکیی ڕۆژ و بە چاوی خۆمان دەبینین کە: میهرەبانی و بەزەیی و دەست ڕەنگینی‌یەکی فراوان دەورەی هەموو سەرزەویی داوە. ئەوەتا هەر کە بەهاری ڕازاوە و دڵڕفێن دێتە کایەوە، "میهرەبانی" هەموو درەخت و ڕووەکە بەردارەکان دەڕازێنێتەوە و، وەك حۆریی بەهەشت بەرگی قەشەنگیان لەبەر دەکات و، چەندین جۆری ڕەنگاوڕەنگ و جیاجیای میوەیان دەداتە دەست و، لەم ڕێگایەوە پێشکەشمانی دەکات و دەڵێت: (فەرموون بخۆن، نۆشتان بێت)!

دەبینیت لەسەر دەستی مێشێکی ژەهراویی وەك "هەنگ" هەنگوینێکی شیفا بەخشمان دەرخوارد دەدات و، ئاوریشمێکیشمان لەبەر دەکات کە مێرووەیەکی بێ دەست و پێ دەیچنێت و، لە مشتێك "تۆو"دا هەزاران تەن خواردەمەنی هەڵدەگرێت و دەیپارێزێت و بۆ ئێمەی دەکات بە گەنجینەیەکی پاشەکەوت کراو بۆ کاتی پێویست.

ئەو کەسەی کە ئەم میهرەبانی‌یە فراوان و بەزەییە گشتی و بەخشش‌ە هەمە لایەنەی هەیە، بێ هیچ گومانێك، بەندە ئیماندارە خۆشەویستەکانی خۆی هەرگیز لەناو نابات، ئەوانەی کە نیعمەتی خۆی بەسەردا باراندوون و پێگەیاندوون و، تا ئەم پلەیەش لەناو سۆز و چاودێریی خۆیدا ڕێزی لێ ناون. نەخێر، لەناویان نابات. بەڵکو کاروباری ژیانی دنیایان کۆتایی پێ دەهێنێت، تاکو بۆ چەندین میهرەبانیی تری فراوان و گەورەتر ئامادەیان بکات.

بەم جۆرە هەردوو ناوی: "الرحمن" و "الکریم"ی ناوە جوانەکانی خوای گەورە، وەڵامی ئەم پرسیارەی سەبارەت بە دواڕۆژمان دەدەنەوە و، پێمان دەڵێن: "الجنة حق".

☐ پاشان دەبینین کە کارمەندی‌یەکانی بوونەوەران لەسەر تەرزی "دانایی" دەچنرێن و بە تەرازووی "دادگەری" دەپێورێن. ئەم دوانەش (واتە دانایی و دادگەری) دوو تەرازووی ئەوەندە ورد و سەرنەکەر و هەستیارن کە ژیریی مرۆڤ لەوان باشتر شك نابات..

بۆ نموونە: "دانستی ئەزەلیی خواوەند" هێزێکی پارێزەری ئەوتۆی بە مرۆڤ بەخشیوە کە لە قەوارەی دەنکە خەرتەلەیەکدایە و، وەکو کتێبخانەیەکی تابلێی بچووك وایە و، هەرچی ڕووداوی لەژمارەبەدەری ژیانی مرۆڤە تیایدا نووسراوە و ئەو "دانست"ە لە سووچێکی مێشکدا بۆی داناوە. تاکو ڕۆژی قیامەتی یاد بخاتەوە، ئەو ڕۆژەی کە لاپەڕەی کردەوەکانی مرۆڤی تێدا بەرچاو دەخرێت.

پاشان "دادگەری‌یەکی ڕەها" دەبینیت کە ئەندامەکانی لەشی هەرچی زیندەوەرە لە جێی شیاوی خۆیدا دادەنێت و، بە تەرازوویەکی تابلێی وردەکار ڕێکی دەخات. ئەمەش هەر لە میکرۆبێکی بچووکەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە کەرکەدەنێکی گەورە و، لە هەنگێکی لاوازەوە تا دەگاتە هەڵۆیەکی

سامناك و، لە تاقە گوڵێکەوە تا دەگاتە بەهارێك، کە بە ملیۆنان و تریلیۆنان گوڵ ڕازاوەتەوە.

دەبینیت ئەم دادگەرییە ڕەهایە، هاوسەنگییەکی بێ کەموکووڕی و، ڕێکوپێکییەکی پڕ لە مەبەست و داهێنانکاری بە هەموو ئەندامێك دەبەخشێت. هەموو ئەمانەش لە دوو توێی جوانییەکی سەرنج ڕاکێش و ڕازاوەدا و لە ڕادەیەکی وادا کە بوونەوەران چەند نموونەیەکی بەرجەستەن بۆ داهێنان و ڕێکوپێکی و جوانی.

سەرەڕای ئەوەی کە مافی ژیان بە هەموو گیاندارێك دەبەخشێت و ڕێی ژیانی بۆ ئاسان دەکات و، چەندین تەرازووی بەرزی دادگەریی بۆ دادەنێت، وەك ئەوەی کە (پاداشتی چاکە، چاکەیە و.. هی خراپەش، خراپەیەکی وەك خۆیەتی)..

لە هەمان کاتیشدا ئەم دادگەرییە ڕەهایە، بەهۆی ئەو سزا توندوتیژەی کە لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە تا ئێستا، بەرامبەر خوێن مژ و ستەمکاران بەکاری هێناوە، هێز و هەمیشەیی خۆی دەرخستووە.

جا هەروەك "خۆر" بە بێ ڕۆژ نابێت، "دانست" و "دادگەری"ی خواوەندیش بە تەواوی نایەنەدی، گەر ژیانێکی تری هەمیشەیی پەیدا نەبێت. لەبەر ئەوە، دانایی و دادگەری هەرگیز بە کۆتایی پێ هێنانێکی بێ دانایی و ڕاستی و دادی وەك ئەوە ڕازی نابن کە ستەمکارە سەرسەختەکان و، ستەم لێکراوە داماوەکان وەکو یەك لەناوبەرن و، پاشان زیندوو نەکرێنەوە! نەخێر بەم ئەنجامە ڕازی نابن. کەواتە دەبێ ژیانێکی تری هەمیشەیی ببێت کە: "دانایی" و "دادگەری" بە تەواوی ڕاستیی خۆیانی تێدا دەربخەن.

بەم جۆرە، ئەم ناوە جوانانەی خوای گەورە: "الحکیم" و "الحکم" و "العدل" و "العادل" وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەدەنەوە کە لە بارەی ئاخیرەتەوە کردمان.

❐ پاشان بە چاوی خۆمان دەبینین کە هەرچی شت لەم بوونەوەرەدایە، سەرجەمی ئەو پێداویستییانەی بۆ دابین دەکرێن کە خۆی ناتوانێت بەدەستیان بهێنێت و، ئەو شتانەشی دەدرێتێ کە بە شوێنیاندا دەگەڕێت و بە پاڕانەوە داوایان دەکات، ئیتر ئەم پاڕانەوەیە چ بە زمانی پێویستییەکانی بێت و چ بە زمانی ئامادەییە سروشتییەکانی. هەروەها لە باشترین و لەبارترین کاتدا لە لایەن خاوەنی فراوانترین میهرەبانی و ڕەهاترین بیستن و گشتیترین بەزەییەوە، هەموو ئەمانەی پێ دەبەخشرێن.

هەروەها دەبینین کە زۆربەی نزا و پاڕانەوە ئیرادییەکانی مرۆڤ گیرا دەبن. بە تایبەتی پاڕانەوەی مرۆڤە هەڵبژاردەکان و، لە نێوان ئەوانیشدا هی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت- زۆربەیان بە جۆرێکی لە عادەت بەدەر گیرا دەبن.

ئنجا ئەو هەموو گیرابوونی دوعا و دابینکردنی پێداویستییانە، تێمان دەگەیەنن کە بێ هیچ گومانێك لە پشتی پەردەی غەیبەوە خوایەکی بیسەر و فریادڕەس هەیە کە ئاخ و نالەی هەموو خاوەن بەلا و گیروگرفتێك دەبیستێت و گوێ بۆ هەموو هەژارێك ڕادەگرێت و، نزمترین پێویستیی بچووکترین بەدیهێنراو دەبینێت و، شاراوەترینی ئاخ و هەناسەی لاوازترین شت دەبیستێت و، میهرەبانیی خۆی پێ دەبەخشێت و فریای دەکەوێت و ڕازیی دەکات.

مادەم ئەمە وابێت، ئەوا ئەو دوعایەی کە بۆ هەتاهەتایی و بەختەوەریی هەمیشەیی دەکرێت و، لە هەموو دوعاکانی تر باشتر و گشتیترە و، پەیوەندیی بە هەموو بوونەوەران و گشت ناوە جوانەکانی خوای گەورە و سیفەتە بەرزەکانیەوە هەیە، ئەم دوعایە کە باشترین بەدیهێنراو دەیکات کە مرۆڤە و، پێغەمبەریش ﷺ کە گەورەترین و خۆشەویستترین بەندەی خوایە و پێشەوای ئەو پێغەمبەرانەیە کە خۆری تیشکدار و پێشڕەوی مرۆڤایەتین، ئەم

پێغەمبەرە مەزنە ﷺ، لەناو دوعا و نزاکانیدا ئەم دوعایە دەکات و، پێغەمبەرانی تریش "ئامین"ی بۆ دەکەن. تەنانەت بە لای کەمەوە هەرچی ڕۆژە چەندین جار نەتەوەکەی خۆی بە سڵاوات لەسەردانی "ئامین" بۆ دوعاکەی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ﷺ دەکەن. بەڵکو هەموو بوونەوەرانیش لە دوعاکەیدا بەشدارن و دەڵێن:

(ئەی پەروەردگارا ئێمەش وەك ئەو هانات بۆ لا دەبەین و لێت دەپاڕێینەوە کە نزاکەی گیرا بکەیت)..

بێ گومان ئەم جۆرە دوعا گشتییانە، کە لە لایەن پێغەمبەرێکی ئاوا خۆشەویستەوە ﷺ و لە نێوان ئەو هەلومەرجانەدا بۆ مانەوە و هەمیشەیی دەکرێن، هەرگیز دەست بە ڕوویانەوە نانرێت.. هەر تەنها ئەم دوعایە هۆکارێکی سەروزیادە بۆ پەیدا کردنی بەهەشت و هێنانەدیی قیامەت، لە نێوان ئەو هەموو هۆکارە لەژمارەبەدەرانەی تردا کە بەدیهێنانی قیامەت پێویست دەکەن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بەدیهێنانی قیامەت بە لای دەستەڵاتی پەروەردگارەوە وەك بەدیهێنانی وەرزی بەهار ئاسانە.

بەم جۆرە، ناوە جوانەکانی: "المجیب" و "السمیع" و "الرحیم"ی خواوەند، وەڵامی پرسیارەکەمان دەدەنەوە.

❐ پاشان ئەو دیاردانەی مردن و زیندووبوونەوە کە لەسەر زەویدا بە گشتی لە گۆڕینی وەرزەکاندا ڕوو دەدەن، دەبن بە بەڵگەیەکی ئاشکرای وەك ڕۆژی ڕووناك لەسەر ئەوەی کە لە پشت پەردەی غەیبەوە پەروەردگارێك هەیە ئەم زەوییە زەبەلاحە بەوپەڕی ئاسانی و لەوپەڕی ڕێکوپێکیی وەك ئاسانی و ڕێکوپێکیی بەڕێوەبردنی "باخچەیەکی بچووك" بەڵکو "درەختێك" بەڕێوە دەبات و، وەرزی فراوانی بەهاریش بە ئاسانیی بەڕێوەبردن و جوانیی ڕازاندنەوەی یەك دانە گوڵ دەڕازێنێتەوە و، لەسەر

لاپەڕەی زەویدا سێ سەد هەزار جۆری ڕووەك و زیندەوەران دەنووسێت، کە وەك سێ سەد هەزار کتێب وان و نموونەی حەشر و نەشر پیشان دەدەن..

جا ئەم پەروەردگارە بەتوانایەی کە بێ هیچ سەر لێ شێوان و هەڵەیەك و، بەوپەڕی ڕێکوپێکیی پڕ لە واتای ڕەوانەوە، ئەم هەموو نموونە بەیەکداچووانە دەنووسێت.. لەگەڵ ئەم شکۆمەندی و گەورەییەدا، دەریدەخات کە خاوەنی توانستێکی کاریگەرە و، میهرەبان و دانایە و، میهرەبانی و داناییەکەی ئەو هەموو بوونەوەران دەگرێتەوە. ئەوەتا پلەیەکی بڵندی بە مرۆڤ بەخشیوە و، ئەم گەردوونە مەزنەشی بۆ ژێربار خستووە و، کردوویەتی بە مەڵبەند و نیشتەجێی ئەو..

هەروەها مرۆڤی کردووە بە جێنشینی خۆی لەسەر زەویدا و، ئەو ئەمانەتە گەورەیەشی خستووەتە ئەستۆ کە زەوی و چیا و ئاسمانەکان هەڵیان نەگرت و، بەسەر هەموو بوونەوەرانی تردا پێشی خستووە و، ئنجا بە گوفتاری پەروەردگارانە و پشتگیری کردنی خۆیشی شەرەفمەندی کردووە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە هەموو ئەو کتێبانەدا کە بۆ گرۆی مرۆڤی ناردوون، لە لای خۆیەوە پەیمان و بەڵێنی بەم مرۆڤە داوە کە لە ژیانی هەتاهەتایی ئەودنیادا بەختەوەریی هەمیشەیی پێ ببەخشێت..

کەواتە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ئەم خواوەندە دەرگاکانی بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ ئەم مرۆڤە دەخاتە سەرپشت و، قیامەت و حەشر بە حەتمی دەهێنێتەکایەوە، کە ئەمەش کارێکە لە لایەن خواوەندەوە زۆر لە دروستکردنی وەرزی بەهار ئاسانترە.

بەم جۆرە، هەریەك لەم ناوە جوانانەی خوای گەورە "المحيي" و "المميت"و "الحي" و "القيوم" و "القدير" و "العليم" وەڵامی پرسیارەکەمان دەدەنەوە.

لە ڕاستیدا ئەو توانستە خواییەی کە ڕەگی درەخت و گژو گیاکان بە گشتی لە هەموو بەهارێکدا زیندوو دەکاتەوە و، سێ سەد هەزار جۆر نموونەی حەشر و نەشر لە نێوان ڕووەك و زیندەوەراندا دروست دەکات.. بەڵکو کاتێ کە بۆ هەزار ساڵ لە تەمەنی هەریەك لە نەتەوەی حەزرەتی محەممەد ﷺ و نەتەوەکەی حەزرەتی مووسا - درووودی لەسەر بێت - دەڕوانین و بەراوردیان دەکەین، دەبینین ئەو توانستە خواییە لە دوو هەزار "بەهار"دا هەزار نموونە و بەڵگە لەسەر حەشر و نەشر دەهێنێتەوە[1].

کەواتە ئیتر چۆن حەشر و نەشری جیسمانی لەو توانستەی خواوەند بە دوور بزانین کە ئەمەی لە توانادایە؟ ئایا بە دوور زانینی ئەم کارە لەو توانستەوە بەڵگەی ئەوپەڕی کتوکوێری نییە؟

❐ پاشان سەد و بیست و چوار هەزار کەس لە چاکترین بەرەکانی نەوەی ئادەم، کە پێغەمبەرانن - درووودیان لەسەر بێت - بە یەکدەنگی و پشت بەستن بە هەزاران بەڵێن و پەیامی خوای گەورە، بەختەوەریی هەمیشەیی ئەودنیایان ڕاگەیاندووە و، ئەم ڕاستییەشیان بە موعجیزە ئاشکرا و ڕوونەکانیان چەسپاندووە.

چەندین ئەولیا و پیاوچاکی لەژمارەبەدەریش، بە "کەشف و چێژی تایبەت بە خۆیانەوە" تەسدیقی ئەو ڕاستییەیان کردووە.. کەواتە دەبێ ئەو ڕاستییە وەکو ڕۆژی ڕۆشنا ئاشکرا و ڕوون بێت و، هەرکەسیش گومانی لەمەدا بێت، لە نیعمەتی ژیری بێ بەش بێت.

چونکە هەر بڕیارێك کە پسپۆڕێك یان دوو پسپۆڕی زانستێك - یان پیشەیەك - کە لە چوارچێوەی پسپۆڕی و شارەزایی خۆیاندا دەری بکەن،

---

(١) هەرچی بەهاری نوێیە، بەڵگەی حەشری بەهاری پێشووە کە ژیانی تەواو بووە و قیامەتی بەرپابووە. (دانەر)

بەها و بایەخی بیروڕای هەزاران کەسی تر دەسڕێتەوە کە لەو بابەتەدا پسپۆڕ نەبن و ئینکاریی ئەو شتە بکەن کە پسپۆڕانی بواری خۆی دەیچەسپێنن، با ئەوان کە لەم بوارەدا پسپۆڕ نین لە شتی تردا پسپۆڕ و شارەزاش بن[1].

هەروەها بڕیارێك کە بە شایەتیدانی دوو شایەتی "چەسپێنەر" دەرکرابێت، بەسەر قسەی هەزاران کەسدا سەردەخرێت کە "نەفی" و ئینکاریی ئەو مەسەلەیە بکەن کە شایەت چەسپاندبێتی، وەك: بینینی مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان لە "یوم الشك"دا و، ئیددیعاکردنی بوونی باخی "گوێزی هیند" کە بەرەکەی وەك قوتووی شیر وایە.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو کەسەی "چەسپێنەر"ە دەتوانێت تەنها بە ئاماژەکردن بۆ ئەو شتە، یان بە پیشاندانی گوێزی هیندی، یان بە پیشاندانی جێگاکەی، ئەو کێشەیە بباتەوە..

بەڵام ئەو کەسەی "نەفی" و ئینکاریی بوونی شتی وا دەکات، هەرگیز ناتوانێت ئەم "نەفی کردن"ە بچەسپێنێت. مەگەر هەموو جێگا و قوژبنێکی ئەم بوونەوەرە بگەڕێت!

هەر بەم چەشنە، ئەو کەسانەش کە هەواڵی بەهەشت و خانەی بەختەوەریی هەمیشەیی ڕادەگەیەنن، تەنها بە پیشاندانی یەك دانە لە شوێنەوارەکانی بەهەشت، یان نیشانەکانی، یان یەکێك لە سێبەرەکانی، داواکەیان دەچەسپێنن و کێشەکەش دەبەنەوە.

بەڵام ئەو کەسەی ئینکاری و "نەفی"ی بوونی بەهەشت دەکات، با زۆر ماندووش ببێت، هێشتا هەر ناتوانێت هیچ پاڵپشتێك بۆ ئەو نەفی کردنە بدۆزێتەوە و قسەکەی خۆی پێ بچەسپێنێت، مەگەر هەرچی شوێن و کات

---

(١) وەك ئەوەی کە لە دەستنیشان کردنی نەخۆشییەکدا بایەخ بۆ قسەی پزیشکێك دادەنرێت و قسەی ئەم پزیشکە هی هەزاران ئەندازیار دەسڕێتەوە. (وەرگێڕ)

هەیە، هەر لە ئەزەلەوە تا ئەبەد، بگەڕێت و سەیریان بکات و پیشانی غەیری خۆیشیانی بدات کە شتی وا نی‌یە، ئنجا دەتوانێت "نەبوون"ە کەی بچەسپێنێت!!

لەبەر ئەم دانستەیە کە زانا لێکۆڵەرەکان بەو دەستوورە بنچینەییە ڕازی بوون کە دەڵێت:

(نەفی کردنێك جێگاکەی دیاریکراو نەبێت - وەك نەفی کردنی ڕاستی‌یەکانی ئیمان کە هەموو گەردوون دەگرنەوە - هەرگیز بۆ هیچ کەسێك ناچەسپێت، ئەگەر کارەکە خۆی لە خۆیدا شتێکی مەحاڵ نەبێت)!

کەواتە بەپێی ئەم ڕاستی‌یە، نابێ ئینکاری کردنی هەزاران فەیلەسووف هیچ گومان و دوودڵی‌یەك لە دڵماندا سەبارەت بەم مەسەلە ئیمانی‌یانە دروست بکات، لە بەرامبەر یەك کەسی ڕاستگۆوە کە ئەم هەواڵەی دابێت.

ئنجا دەبێ ئەو کەسە چەندە بێ مێشك بێت کە خۆی بە هەر گومانێك لە پایەکانی ئیمان لەکەدار دەکات، تەنها لەبەر ئینکاری کردنی چەند فەیلەسووفێکی کەم لەوانەی کە جگە لە "مادده" هیچی تر نابینن، تەنانەت دڵیشیان مردووە و هیچ هەستێك بە "مەعنەویات" ناکەن؟! لە کاتێکدا کە سەد و بیست و چوار هەزار "چەسپێنەر" لە "پسپۆڕان"ی ئەم بوارە - کە پێغەمبەرانی ڕاستگۆن، درووديان لەسەر بێت- و چەندین چەسپێنەری تریش لە پسپۆڕان، کە حەقرەوان و پیاوچاکان و ئەولیا و زانایانی خاوەن لێکۆڵینەوەن، هەموویان بە یەکدەنگی لەسەر ئەو پایانەی ئیمان یەکیان گرتووە!

❑ پاشان ئێمە چ لە خۆماندا و چ لە دەوروبەرماندا دەبینین کە میهرەبانی‌یەکی گشتی و، دانایيەکی فراوان و، چاودێری‌یەکی هەمیشەیی وەك ڕۆژی ڕووناك، ڕووناکیی خۆی بڵاو کردووەتەوە..

هـــەروەها شـــوێنەواری پەروەردگاری‌یـــەکی بەســـام و، ڕوونـــاکیی دادگەری‌یەکی بینەر و، ڕەنگدانەوەی چەند کاروبارێکی گەورە و شکۆمەند دەبینین.

تەنانەت دانایـیـەکی ئەوتۆ دەبینین کە بـە هـەرچی درەختـدا هەیـە و بـە ئـەندازەی ژمـــارەی گـــوڵ و بـــەروبوومەکانی ئـــەو درەختـــە، دانـــایی هەڵدەواسێت و.. میهرەبانی‌یەکی وەهاش دەبینین کـە بە ئەندازەی ژمـارەی هەســت و هێزەکــانی مــرۆڤ چاکــەی بــە ئەندامــەکانی بەخشــیوە و.. دادگەری‌یــەکی شــکۆمەندی وامـان بـەرچاو دەکـەوێت کـە بـە شــوولّی سزاسەندنەوەی تایبەتیی خۆی چەندین نەتـەوەی تاوانکـاری چەشنی قـەومی نـوح - درودی لەسـەر بێــت - و قـەومی عـاد و سـەمود و، کەسـانی وەك فیرعـەون، لـەناو دەبـات.. لـە هـەمان کـاتدا، ئـەم دادگەری‌یـــە خـاوەنی چاودێری‌یـەکی وەهایـە کـە پارێزگاریی مافـەکانی بچووکـترین و لاوازتریـن بەدیهێنراو دەکات.

ئەم ئایەتە پیرۆزە گەورەیی و سام و شکۆی ڕەهـای ئەو پەروەردگارێتی‌یـە مەزنە ڕادەگەیەنێت کە دەفەرموێ:

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْـــوَةً مِـــنَ الأَرْضِ إِذَا أَنْتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ (الروم:٢٤).

چونکە ئەم ئایەتە پـیرۆزە دەری دەخـات کـە زەوی و ئاسمانـەکان وەك ئەو سەربازانە وان لە دوو سەربازگەدا ڕاکشابن، جـا هـەروەك ئەو سـەربازانە بە بانگەوازی پێشەواکەیان یان تەنها بـە لێدانـی شـەیپووری سـەربازی یەکسـەر دەڕۆنــە ســەنگەری تایبــەتی‌یان و چــەکی خۆیـــان وەردەگـــرن، زەوی و ئاسمانەکانیش بە هەمان جۆرن، هـەر کـە بـە شـەیپووری ئیسـرافیل - درودی لەسەر بێت - بانگ لە نوستووانی ناویان دەکرێت، یەکسەر لـە گۆڕەکانیـان

دەردەچن و بەرگی جەستەیان لەبەر دەکەنەوە و بەدەم ئەو بانگەوازەوە دەڕۆن.

تەنانەت بە چاوی خۆمان ئەم گەورەیی و گوێڕایەڵی‌یە لە هەموو بەهارێکدا دەبینین. ئەوەتا هەرچی سەرباز لە سەربازگەی زەویدا هەن، تەنها بە فووپیاکردنێکی شەیپوورەکەی مەلائیکەتی هەورە بروسکە، یەکسەر زیندوو دەبنەوە و حەشر و نەشر دەکرێن..

جا مادەم ئێمە بە چاوی خۆمان ئەم دەستەڵاتە گشتی‌یەی خوای گەورە و، ئەم گوێڕایەڵی‌یە تەواوەی ئەوانە دەبینین، ئەوا دەبێ ئەو میهرەبانی و دانایی و چاودێری و دادگەری و دەستەڵاتە هەمیشەییە، ئاکام و مەبەستی خۆیان لە دوارۆژێکی تردا بهێننەدی. واتە - وەك لە وتەی دەهەمدا چەسپاندوومانە - هەموو ئەمانە داخوازی بوونی زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایین و ئەم زیندووبوونەوەیە بە پێویست دادەنێن. لەبەر ئەوەی هیچ گومانێك لە هاتنی دوارۆژدا نی‌یە، بەڵکو نەهاتنی دوارۆژ بە هەزار جار کارێکی مەحاڵە.

چونکە ئەگەر قیامەت و دوارۆژ نەبێت، ئەوا ئەو "میهرەبانی"یەی کە لەوپەڕی جوانیدایە، دەبێت بە توندوتیژی‌یەکی لەوپەڕی ناشیرینی و.. ئەو "دانایی"یەی کە لەوپەڕی تەواویدایە، دەبێت بە نوقسانی و بێ مەبەستی و زیادەڕەویی لەڕادەبەدەر و.. ئەو "چاودێری"یەی کە لەوپەڕی لوتف و جوانیدایە، دەگۆڕێت بە سووکایەتی پێکردنێکی لەوپەڕی تاڵی و ناشیرینیدا و.. ئەو "دادگەری"یەش کە لەوپەڕی حەق و ئینسافدایە دەگۆڕێت و دەبێت بە تاریکی‌یەك لەوپەڕی توندوتیژی و ڕەقی و ناحەقیدا!

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، نەهاتنی قیامەت مانای نەمانی هەیبەت و شکۆمەندی و هێزی دەستەڵاتداریی خوای گەورەیە و، ئەوە دەگەیەنێت کە کەماڵی پەروەردگاریی خوا بە کۆڵەواری و ناتەواوی تاوانبار بکرێت.

هەموو ئەمانەش ئەوەندە بەتاڵ و مەحاڵن کە ژیریی هیچ مرۆڤێك - هەر کەسێك بێت - قبووڵیان ناکات و، کارێکی تابڵێی نەشیاون. چونکە هەموو خاوەن هەست و شعوورێك دەزانێت کە خواوەند مرۆڤی لەسەر جوانترین شکڵ و شێوە بەدی هێناوە و، بە باشترین پەروەردەش پەروەردەی کردووە و، چەند ئەندامێکی وەك "ژیری" و "دڵ"یشی پێ بەخشیوە، تاکو بەهۆیانەوە چاوەڕوانیی بەختەوەریی هەمیشەیی بکات و، بەو بەختەوەرییەش شادی دەکات.. هەروەها هەست بە ئەندازەی ئەو توندوتیژی و ستەمە دەکات کە ئەگەر چارەنووسی ئەم مرۆڤە ڕێزلێگیراوە بە "لەناوچوونی هەمیشەیی" کۆتایی پێ بێت..

هەروەها هەموو خاوەن هەست و شعوورێك تێدەگات کە زیندوو نەبوونەوە تابڵێی لە "دانایی"یەوە دوورە. چونکە "زیندوو نەبوونەوە" هەرچی ئەندام و هێزی سروشتیی مرۆڤ هەن - کە هەزاران سوودیان تێدایە - بێ ئامانج و بێ نرخ دەردەکات. لە کاتێکدا کە خواوەند هەر تەنها لە مێشکی مرۆڤدا سەدان دانست و سوودی داناوە.. هەروەها تێدەگات کە نەبردنەسەری بەڵێن و پەیمان، کۆڵەوارییەکی ئاشکرا و نەزانییەکی تەواو دەگەیەنێت. کە ئەمانەش تابڵێی پێچەوانەی گەورەیی ئەو دەستەڵاتداری و کەماڵ و پەروەردگارێتییەن.

خواوەندیش گەلێ گەورە و بڵندە بەسەر ئەو چەشنە سیفەتانەدا کە سەرتاپا ناتەواوین..

دەتوانیت بۆ خۆت قیاسی "چاودێری" و "دادگەری"یش لەسەر ئەمەی پێشوو بکەیت.

بەم جۆرە، ناوە جوانەکانی: "الرحمن" و "العدل" و "الكريم" و "الحاكم"، بەو حەقیقەتەی کە باسمان کرد، وەڵامی ئەو پرسیارەی داینەوە کە

لەبارەی دواڕۆژەوە کردمان و، بە چەشنێکی بێ گومان و بە شێوەیەکی ڕوونی وەك خۆری ئاسمان، ئاخیرەتیان بۆ چەسپاندین.

□ پاشان پارێزگاری‌یەکی بەسام و شکۆی گشتی دەبینین کە بەسەر هەموو زیندەوەرێکدا فەرمانڕەوایە و، بەسەر هەموو ڕووداوێکدا دەستەڵاتدارە و، وێنە زۆرەکانی دەپارێزێت و، کرداری کارمەندی‌یە سروشتی‌یەکانی لە چەند تابلۆیەکی میسالیدا.. لە تۆو و ناوکەکانیدا.. لە هێزە پارێزەرەکانی(قواه الحافظة)دا، دەنووسێت و تۆماریان دەکات. بە تایبەت "حافیزە"ی مرۆڤ کە کتێبخانەیەکی مەزنی بچووککراوەیە و لە مێشکیدا دانراوە. ئەم "حافیزە"یە هەموو ئەو شتانە لە گشت ئاوێنە ماددی و مەعنەوی‌یەکاندا تۆمار دەکات.

هەر کە بەهار دێت، ئەو بەهارەی کە گوڵێکی بەرجەستەی بەدیهێنراوی توانستی خوای گەورەیە، یەکسەر ئەم "پارێزگاری"یە هەموو ئەو نووسراوە مەعنەوی‌یانەمان بۆ دەردەخات و بە شێوەیەکی بەرجەستە دەیانخاتە پێش چاومان و، ئەو ڕاستی‌یەی حەشرمان پیشان دەدات کە لە ئایەتی: ﴿وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾دا هەیە، ئەمەش بە ملیۆنان ملیۆن بەڵگە و نموونەوە ڕادەگەیەنێت.. هەروەها بۆمان دەچەسپێنێت کە هەرچی شت هەیە، بە تایبەتی زیندەوەران، لەناو ئەوانیشدا بە تایبەتی "مرۆڤ"، بۆ ئەوە دروست نەکراون کە بەرەو "نەمان" و لەناوچوون بڕۆن و کۆتاییان پێ بێت، بەڵکو بۆ ئەوە دروست کراون کە بەهۆی سەرکەوتنیانەوە بەسەر ئارەزووەکانی دەروونیاندا بەرەو "مانەوە" بڕۆن و، بە بۆنەی پاککردنەوەی دەروونیشیان بڕۆنە ناو جیهانی هەمیشەیی و، بەهۆی ئەو لێهاتن و توانایانەش کە لە سروشتیاندا هەیە، بۆ ئەرك و فەرمانبەری‌یەکی هەمیشەیی و هەتاهەتایی بڕۆن کە لەودنیای هەمیشەییدا چاوەڕوانیان دەکات.

بەڵێ، هەرچی ڕووەك و درەخت و، هەرچی تۆو و دەنکی تـۆوی درەختە لەژمارەبەدەرەکان هەن و لە قیامەتی پـایزدا مـردن، هەرکـە حەشـری "بـەهار" دێتە کایەوە، هەریەکەیان بـە زمـانی تایبـەتیی خـۆی ئایـەتی: ﴿وإِذا الصُّحُفُ نُشرت﴾ (التكوير:١٠) دەخوێنێتەوە و تەفسیری یـەکێك لـە واتاکـانی دەکـات. ئەمەش بەوەی کە هەموو بەشێك لە بەشەکانیان هەمان فەرمانبەریی سروشتیی ساڵانی پێشووی دووپات دەکاتەوە..

لـە هـەمان کاتیشـدا گـەورەیی و مـەزنیی "پارێزگـاری" لـە فراوانـترین مەودایدا دەردەخات، وەك لـەم ئایەتـە پیرۆزەدا هەیـە کـە دەفـەرموێ: ﴿هُوَ الأَولُ والآخرُ والظَّاهِرُ والبَاطِنُ﴾ (الحديد:٣). هەروەها ڕێنماییمـان دەکـات بـۆ چوار ڕاستیی گەورە کە لە هەموو شتێکدا هەن و، بەڵگەیەکی بەهێزن لەسەر حەتمیەتی هاتنی حەشر، وەك حەتمیەت و ئاسانیی هاتنی بەهار.

بـەڵێ، نـوور و تیشـکدانەوەکانی ئـەم چـوار نـاوە جوانـەی خواوەنـد، بچووکترین شتی هەندەکی(جوزئی) تـا گـەورەترین شـتی هەمـەکی(کوللـی) دەگرنەوە..

با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە:

"تۆو" کە ئەسڵ و سەرچاوەی درەختە، بە بۆنەی ئەوەی کە خـۆی دەخاتـە بەر تیشکی ناوی "الأول"ی خوای گـەورە، ئەوا گـەورەیی "پارێزگـاری"مـان بۆ دەردەخات. ئەمەش بەوەی کە زۆر بە وردی پلانی درەختێکـی تـەواوەتی و چـەندین ئـامێری سـەیری تێـدا پـارێزراوە، تـاکو بـە تـەواوی و بـێ هیـچ کەموکووڕی‌یـەك ئـەو تۆوە بەدیبهێنێت و گەشـەی پـێ بکـات. هـەروەها بـەوەی کـە هەرچـەند خـۆی لـە خۆیدا قوتوویـەکی گەلـێ بچووکـە، بـەڵام هەموو مەرجەکانی پێکهاتنی درەختێکی تەواوی تێدا حەشار دراوە.

"میوە و بەروبوومی درەخت"یش وەك "تۆو" وایە؛ چونکە بە بۆنەی ئەوەی خۆی بەر تیشکی ناوی پیرۆزی "الآخـــر"ی خوای گەورە دەخات، ئەوا شایەتی‌یەکی ڕاست لەسەر ئەو "پارێزگاری" ە دەدات. ئەمەش بەوەی کە هەرچەند خۆی لە خۆیدا سندووقێکی بچووکە، بەڵام پێڕستێکی ئەوتۆی تێدایە کە هەرچی فەرمانبەریی سروشتیی ئەو درەختەیە تیایدا تۆمار کراوە و پارێزراوە و، لاپەڕەی کردەوەکانی ئەو درەختەی تێدایە و، هەموو یاساکانی ژیانی دووهەمی درەختەکەی تێدا ڕێکخراوە.

"خودی درەختە بەرجەستە"کەش، لەگەڵ دەرخستنی "پارێزگاریی ڕەهادا"، مەزنیی توانست و کەماڵی دانایی و جوانیی میهرەبانیش دەردەخات. بەهۆی ئەوەی کە خۆی دەخاتە بەر تیشکی ناوی جوانی: "الظاهر"ی خوای گەورەوە و، بەم کارەش ئەو "پارێزگاری"یەمان بۆ دەهێنێتە پێش چاو، لە ڕێگای ئەو کاڵا جوانانەی کە وەك کاڵای حۆری بە حەفتا نەخشونیگاری بێ وێنە و ڕەنگاوڕەنگی جوان نەخشێنراون و ڕازاونەتەوە و، لەبەر ئەو درەختە کراون.

"ئامێرە ناوەکی‌یەکانی ئەو درەختە"ش، کە وەکو ئاوێنە ڕووناکی‌یەکانی ناوی: "الباطن"ی خوای گەورە پیشان دەدەن، بە هەمان جۆر و بە چەشنی ڕووناکیی خۆر کەماڵی توانست و دادگەری و جوانیی میهرەبانی و دانایی دەچەسپێنن. چونکە ئەم ئامێرە ناوەکی‌یانەی درەخت کارگەیەکی ناوازەی ڕێکوپێکن، تەنانەت تاقیگەیەکی گەورەی کیمیان، بەڵکو خانەیەکی ئەوتۆی ئازووقەن کە خۆراکی پێویست بە سەرجەم لق و پەل و بەر و گەڵاکان دەبەخشن.

جا هەروەك "تۆو" و "بەروبووم" و "دەرەوە" و "ناوەوە"ی درەخت، تیشکدانەوەی چوار ناوە جوانەکانی: "الأول والآخر والظاهر والباطن"یان

دەرخست، گۆی زەویش - بە هەمان جۆر - ئەمە دەردەخات و، ڕوونی دەکاتەوە کە: خواوەندی پارێزەر(الحفیظ)ی شکۆمەند هەرچییەك دەکات ئەوا بەپێی توانست و دادگەریی و دانایی و میهرەبانییەکی ڕەها دەیکات.

چونکە گۆی زەوی لە ڕووی ئالوگۆڕی وەرزەکانی ساڵەوە وەك درەخت وایە؛ ئەوەتا هەموو ئەو "تۆوانەی" کە بەهۆی درەوشانەوەی ناوی پیرۆزی (الأول)ی خواوەندەوە، لە پایزدا بە دەستی "پارێزگاری" سپێرراون، وا لە بەهاردا چەندین پەلوپۆی لەژمارەبەدەر بە هەموو لایەکدا دەهاوێژن و ئەندازەیەکی بێ سنووریش لە گوڵ و بەروبوومەکانیان دەم دەکەنەوە و، بەم جۆرە سەرزەوی پۆشاکی ڕازاوەی بەهار لەبەر دەکات. چونکە هەریەك لەو تۆوانە چەند پەڕاوێکی بچووکیان تێدایە کە فەرمانە پەروەردگارییەکانیان تێدا تۆمار کراوە و، لە لاپەڕە بچووکەکانی ئەو پەڕاوەشدا هەموو ئەو کارانەی کە لە ساڵی پێشوودا ئەنجام دراون، نووسراونەتەوە. تەنانەت هەرچییەك پەیوەندیی بە پێکهاتنی ئەو درەختەوە بێت، لەو تۆوانەدا تۆمار کراوە.

کۆتایی درەختی ساڵانەی زەویش ئەوەیە کە: هەموو ئەو کارمەندی و فەرمانبەرییانەی کە درەختەکە ئەنجامی داون و، ئەو تەسبیحات و زیکرە سروشتییانەی لە بەرامبەر ناوە جوانەکانی خوای گەورەوە کردوونی و، ئەو لاپەڕەی کردەوانەش کە دەگونجێ لە "حەشر"ی بەهاری ئایندەدا پیشان بدرێن و بەرچاو بخرێن.. هەموو ئەمانە، لە وەرزی پایزدا لەناو چەند قوتوویەکی وردی بچووکدا دادەنێت و، هەموویان دەداتە دەستی دانایی خواوەندی پارێزگاری شکۆمەند و، بەم کارەی - وە بە چەندین زمانی لە ژمارە بەدەر - ناوی پیرۆزی: "الآخر"ی خواوەند بەسەر گوێ و لە بەرچاوی هەموو بوونەوەراندا دەخوێنێتەوە.

ڕووی ڕواڵـەتی ئـەم درەختـەش، بریتی‌یـە لـەو گوڵـە هەمەکی‌یـە جۆراوجۆرانـەی کـە سێ‌سـەد هـەزار جـۆری نموونـە و نیشـانەی حەشـر دەردەخەن.. بریتی‌یـە لـەو سفرە و خوانـە ڕازاوانـەی خواوەنـدی میـهرەبان و ڕۆزیـدەر و بەخشـندە.. بریتی‌یـە لـەو میوانداری‌یانـەی کـە دەرگاکانیـان بـۆ هـەموو زیندەوەرێـك لەسـەر پشتە. کەواتـە هـەرچی لـە ڕووی دەرەوەی ئـەو درەختەدایە، بە زمانی: بەروبووم و، گوڵ و، تاموچێژیان، ناوی "الظـاهر"ی خواوەند دەخوێننەوە و، بە وێنەی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان ڕاستیی: ﴿وإذا الصُّحُفُ نُشِرَتْ﴾ دەردەخەن.

ناوەوەی ئەم درەختە مەزنەش بریتی‌یـە لـەو عـەمبار و دینـەمۆ زۆرانـەی کـە لـەناو ڕووەکـەکاندان و بزوێنـەری چـەندین مەکینـەی ڕێکوپێـك و کارگـەی وردی لەژمارەبەدەرن و، کاریان بە ڕادەیەکی ئەوتۆیە کە لە تەنها کێشی یـەك "درەم" کەرەسەی خاو یەك "تەن" خۆراك ئامادە دەکەن و بە دەستی برسیانی دەگەیەنن و، بەوپەڕی وردی و بە جـۆرێ کـە هیـچ دەرفـەتێك بـە "ڕێکـەوت" نەدەن یاری‌یان پێ بکات، کارەکەیان ئەنجام دەدەن.

ڕووی ناوەوەی زەوی - بەم کارەی - ناوی پیرۆزی "الباطن"ی خواوەند دەکـات بـە زیکـری خـۆی و هـەردەم دەیڵێتـەوە و دەیچەسپێنێت. بـەڵکو بـە چەشنی ئـەو مەلائیکەتانـەی کـە بـە سـەد هـەزار زمـان تەسبیحات و زیکـری خوای خۆیان دەکەن، ناوەوەی زەویش بە سەد هەزار جۆر و شێوە، ئـەو نـاوە جوانەی خواوەند ئاشکرا دەکات.

هەروەك زەوی سەبارەت بە ژیـانی ساڵانەیەوە وەکـو درەخـت وایـە و، بـە ڕوونی ئەو پارێزگاری‌یەی کە لەو چوار ناوە جوانەی خوادایـە، دەرخسـت و کردی بە کلیلێك بۆ کردنەوەی دەرگای حەشر، هەر بەو جۆرەش سـەبارەت بە ژیانی سەردەم و چەرخەکانەوە، وەکو درەخـت وایـە. چونکـە بـە درێژایی

ئەم سەردەم و چەرخانە بەروبوومی خۆی بەرەو بازاڕی دواڕۆژ بەڕێ دەکات.

بەم چەشنە، گۆی زەوی دەبێت بە ئاوێنەیەکی یەکجار بەرین بۆ ڕەنگدانەوە و دەرکەوتنی ئەو چوار ناوە جوانەی خواوەند و، ڕێگایەکی گەلێ فراوان بەرەو ئاخیرەت دەکاتەوە، بە چەشنێ کە ژیری و زمانی ئێمە لە ئاستی زانینی هەموو لایەنێکی ئەو ڕێگایەدا کۆڵەوار و دەستەوسان دەمێنێت.

لەبەر ئەوە، بەمەی خوارەوە واز دەهێنین و زیاتری لەسەر ناڕۆین:

میلەکانی کاتژمێر، کە چرکە و خولەك و کات و ڕۆژان دەژمێرن، لە نێوان خۆیاندا لە یەك دەچن. ئەوەتا هەریەك لەوان بەڵگەیە لەسەر ئەوانی تر و ئەوان دەخاتەوە یاد و، ئەو کەسەی سەرنجی جموجوولی چرکەژمێرەکە بدات باوەڕ بە جموجوولی میلەکانی تریش دەکات..

دنیاش بەم جۆرەیە؛ وەك کاتژمێرێکی مەزنی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی وایە..

چونکە لەم کاتژمێرە گەورەیەدا، ڕۆژان کە چرکە ژمێری ئەون و، ساڵان کە خولەك ژمێرین و، چەرخەکان کە کاتەکانی دەردەخەن و، سەردەمەکان کە ڕۆژەکانی ئەم کاتژمێرە مەزنە دەژمێرن، هەروەك لە یەك دەچن؛ یەکتریش دەچەسپێنن و دەبنە بەڵگە لەسەر یەکتر.

کە لەم گۆشەیەوە سەیری زەوی دەکەین، دەبینین بە چەند نیشانەیەکی زۆر و لەژمارەبەدەر هەواڵی هاتنی بەیانی و بەهارێکی هەمیشەییمان دەداتێ کە لە دوای دنیای فانی و زستانی تاریکەوە دێن. ئەم هەواڵەشمان بە چەشنێکی بێ گومانی وەك گومان نەبوون لە هاتنی بەیانی بە دوای ئەم شەوەدا و بەهار بە دوای ئەم زستانەدا، دەداتێ.

بەم ڕاستی‌یە، ناوی پیرۆزی: "الحفيـــــظ" و چوار ناوەکەی تر: "الأول، الآخر، الظاهر، البـــاطن" وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەدەنەوە کە لە بارەی حەشرەوە کردمان.

❐ مادەم ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین و بە عەقڵی خۆمان دەزانین کە ئەم "مرۆڤ"ە:

(کۆتایی گەردوون و پوختەی هەموو ئەو سیفەتانەیە کە تیایدایە و..

سەبارەت بەوەی کە "حەقیقەتی محەممەدی"ی تێدایە، ئەوا تۆوی ئەسڵی ئەو درەختەیە و..

گەورەترین ئایەتی قورئانی گەردوونە و..

تەنانەت ئەو ئایەتەیە کە لەو قورئانەی گەردووندا هەڵگری درەوشانەوەی "ناوی مەزن"ی خواوەندە، وەك "آية الكرسي" لە قورئاندا و..

بەڕێزترین میوانی کۆشکی گەردوونە و..

چالاکترین فەرمانبەرە کە ڕوخسەتی پێ دراوە هەڵسوکەوت لەگەڵ دانیشتووانی ئەو کۆشکەدا بکات و..

لەبەر ئەوەی سەدان زانست و هەزاران بەهرەی شیاوی پێ بەخشراوە، کێڵاندنی زەویی خراوەتە ئەستۆ و لێپرسراویی دەرامەت و خەرجی‌یەکانیشی پێ سپێرراوە و..

هەر ئەوە جێنشینی خواوەند لە زەویدا، چونکە هەر ئەوە کە لە لایەن پادشای ئەزەل و ئەبەدەوە نێرراوە و لە ژێر چاودێریی ئەودا کار دەکات و هەموو جێگایەکی گۆی زەوی دەگەڕێت و دەپشکنێت و..

هەر ئەوە کە لە کاروباری زەویدا هەڵدەسووڕێت و، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کردارێکی گەورە و بچووکی لەسەر تۆمار دەکرێت و..

هەر ئەوە لەبەر ئەوەی کە بەندەیی و پەرستشێکی فراوان و گشتیی لە ئەستۆدایە، بەندەیەکی هەمەکیی خواوەند بێت، چونکە ئەو ئەمانەتە هەرە

گەورەیەی پێ سپێرراوە کە نە ئاسمانەکان و نـە زەوی و نـە چیاکـان نەیانگرتـە ئەستۆ، لـە ئـەنجامی هـەڵگرتنی ئـەم ئەمانەتەشـدا دوو ڕێگـای لــە بـەردەمدا کرایەوە: یەکێکیان بۆ خراپکاران و ئەوی تریشیان بۆ بەختەوەران..

هەر ئەوە کـە وەك ئاوێنـە وایـە و، درەوشـانەوەی هـەموو نـاوە جوانـەکانی خـوای گـەورەی تێدا ڕەنـگ دەداتــەوە و، "نـاوی هــەرە مــەزن"یشــی تێـدا دەدرەوشێتەوە..

هەر ئـەو مەبەستە لـەو فەرموودانـەی خـوادا کـە ئاراستەی بەدیـهێنراوانی دەکات و، هەر ئەویشە کـە لـە هـەموو بەدیـهێنراوان زیـاتر لـە فـەرموودەکانی پەروەردگار تێدەگات..

هـەر ئــەوە کــە لــە نێــوان هــەموو بوونــەوەرانی گــەردووندا هــەژارتر و کۆڵەوارترە..

مرۆڤ ئەو زیندەوەرەیە کە بێ دەستەڵاتی و کۆڵەواریی لە سنوور بـەدەرە، لەگەڵ ئەوەشدا لــە ڕادەبـەدەر دوژمـن و شـتی ئازاربـەخش و، هیـوا و ئـاواتی لەژمارە بەدەری هەیە..

هەر ئەوە کە لە نێوان هەموو زیندەوەراندا بە تواناترە و..

هەر ئەویشە کە لە نێوان خۆشی و تامی ژیاندا لە هـەموویان زیـاتر هەسـت بە ئازار دەکات، چونکـە لـەزەت و خۆشـی‌یەکانی ئاوێتـەی چـەندین ئـازاری ناخۆشی ئەوتۆن کە ئەو لەزەتانەی لـێ تاڵ دەکەن..

هەر ئــەوە کە لـە هـەموان زیـاتر لـە تاسـەی مانـەوە و هەمیشـە ژیاندایـە و، زۆرتریش پێویستی پێیەتی و، لە هەموویشیان شیاوترە بۆ هەمیشەیی..

هـەر ئـەوە کـە بـە چـەندین نـزا و لاڵانـەوەی لەژمارەبـەدەر بـۆ "مانــەوە" و "هەمیشەیی" دەلاڵێتەوە..

هەر ئەوە کە تا ڕادەی پەرستن ئەو کەسەی خۆش دەوێت کە چاکەی لەگەڵدا کردووە و نیعمەتی بەسەردا ڕشتووە و، بەمەشەوە ڕاناوەستێ، بەڵکو لە لای کەسان و شتانی تریش ئەو کەسە خۆشەویست دەکات، چونکە ئەو نیعمەتبەخشە شایستەی خۆشەویستییە..

هەر ئەوە گەورەترینی موعجیزەکانی توانستی صەمەدانییەتی خواوەندی پەروەردگارە، تەنانەت هەر ئەوە کە لە ڕاستیدا مایەی سەرسووڕمانە لەناو بەدیهێنراواندا، لەبەر ئەوەی جیهانی گەورەی تێدا کۆکراوەتەوە و لەبەر ئەوەش کە هەموو ئەندام و کۆئەندام و ئامێرێکی شایەتی دەدەن لەسەر ئەوەی کە ئەم مرۆڤە بۆیە دروست کراوە تاکو هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێش ڕووەو هەمیشەیی و نەمری بڕوات).

ئەم مرۆڤەی کە بە چەندین ڕاستیی چەشنی ئەم "بیست"ەی باسمان کردن پەیوەستەی ناوی "الحق"ی خواوەندە و، لەگەڵ ناوی: "الحفیظ"یشدا بە هەمان جۆر پەیوەندییەکی ئاوا بەهێزی هەیە، ئەو ناوەی کە هیچ شتێکی لێ ون نابێت و، نووسەرە بەڕێزەکانی هەموو کردەوەکانی مرۆڤ، کە پەیوەندییان بە بوونەوەرانەوە هەیە، دەنووسن و تۆماریان دەکەن..

ئەم مرۆڤە، بە حوکمی ئەو بیست ڕاستییە، دەبێ حەشر و نشووری بێتە ڕێ و، بە بێ هیچ گومانێك و بەپێی ناوی جوانی: "الحق"یش دەبێ پاداشتی ئەو کردەوە چاکانەی بدرێتەوە کە پێشکەشی کردوون و، لەسەر کەمتەرخەمی کردنیشی لە چاکەدا سزا بدرێت و، گومانیش لەوەدا نییە کە لەسەر ئەو کردەوە هەمەکی و هەندەکییانەی کردوونی و بە ناوی "الحفیظ"ەوە لەسەری تۆمار کراون، دەبێ ببرێت و لە بارەیانەوە پرسیاری لێ بکرێت..

لە ئـەنجامی ئەمەشـدا یـان ئەوەیـە دەرگـای بەختەوەری‌یـەکی هەمیشـەیی و میواندارییەکی ئەبەدیی لـێ دەخرێتـە سـەر پشـت، یـان دەرگــای چـەندین بەندیخانەی سامناك و دەردیسەریی بەردەوامی لە بەردەمدا دەکرێتەوە. چونکە هەرگیز نـاگونجێت ئەفسـەرێك کـە زۆربـەی بەدیـهێنراوانی ئـەم جیهانـەی دابێتەبـەر و لـە کاروبارییـاندا خـۆی هـەڵقورتاندبێت، هیـچ لێپرسـینەوەیەکی نەبێت و، هەروا بڕوات و، لە بەرچاودا ون ببێت و، لە خەو هەڵنەسێنرێت!

چونکە هەرگیز ئەوە ناچێتە عەقڵەوە کە لـە لایەکەوە نزایەکی لـە ویـزەی مێش نزمتر گیرا ببێت و هەموو پێداویستی‌یەکانی ژیانی فریا بخرێت، بەڵام لـە لایەکی ترەوە نزا و پاڕانەوەی ئەوەندە بەهێز و بەتین گیرا نەبێت کە عـەرش و فەرش دەلەرێنێتەوە و، لەو بیست حەقیقەتەوە دەردەچن و هەمووشـیان داوای مانەوە و نەمری دەکەن!

هەروەها ئەوەش ناچێتە عەقڵەوە، بگرە هەرگیز ناگونجـێ ئـەو هـەموو مافـە زۆرانە بە تـەواوی پووچ بکرێنـەوە و بە زایە بدرێـن، بـەڵکو بـە هیـچ جـۆرێ مومکین نی‌یە ئەو "دانایی"یەی کە بە ئـەندازەی باڵـە مێشـێك و بـە شـایەتیی ئەو وردەکاری‌یەی لەو باڵە مێشـەدا هەیە، بێهودەیی و گاڵتەکاریی تێدا نی‌یە، بـە تـەواوی گاڵتـە بـە توانـا و لێهاتنـەکانی مـرۆڤ بکـات کـە هـەر هـەموویان پـەیوەندی‌یان بـەو ڕاسـتی‌یانەوە هەیـە و.. گاڵتــە بــە هــەموو ئــاوات و ئارەزووەکانی بـکات کـە ئەوەندە دوور و درێژن تـا هـەمیشـەیـی دەڕوانـن و بـە ئاواتیەوەن و.. گاڵتە بە هەموو ئەو پەیوەندی و ڕاستی‌یە زۆر و زەبەندانەی بوونـەوەران بکـات کــە توانســت و ئامــادەیی و ئارەزووەکــانی مــرۆڤ دەبووژێننەوە و پەرەی پێ دەسـێنن..

کـەواتــە مـەحــاڵە ئــەو "دانـایی"یـە لـەڕادەبـەدەرە، بـەم ئیسـراف و زیـادەڕەوی و ستەم و ناشیرینی‌یە لەڕادەبەدەرە ڕازی ببێـت. بـەڵکو هـەموو

بوونەوەران بە گشتی دەست بە ڕووی ئەم گریمانەوە دەنێن و دەڵێن: بە سەد پلە و بە هەزاران ڕوو ئەم گریمانە مەحاڵە و هەرگیز ناگونجێ.

ئەم بوونەوەرانە چۆن ئەم شایەتی‌یە نادەن کە هەر خۆیان شایەتن لەسەر ئەم ناوە جوانانەی خواوەند: "الحق" و "الحفیظ" و "الحکیم" و "الجمیل" و "الرحیم"؟

بەم جۆرە، ئەم ناوە جوانانەی: "الحق" و "الحفیظ" و "الحکیم" و "الجمیل" و "الرحیم"ی خواوەند وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەدەنەوە کە لە بارەی دواڕۆژەوە کردمان و، پێمان دەڵێن:

(بەڵێ، حەشر و زیندووبوونەوە ڕاستە و گومانی تێدا نی‌یە و، ڕاستی‌یەکی چەسپاوی بێ گومانە. وەك ئەوەی کە ئێمە لە ڕاستی و حەقیقەتدا هەین و، وەك ئەوەی کە ڕاستیی بوونەوەرانیش ئەو شایەتی‌یەمان بۆ دەدات).

❐ ئەم مەسەلەیە ئەگەر لە ڕۆژی ڕووناك ئاشکراتر نەبوایە، ئەوا زیاتر ڕوونم دەکردەوە. بەڵام بە پوختی لێی دوام و بەو نموونانەی باس کران وازم هێنا. جا لەسەر هەمان شێوە و بەپێی بڕگەکانی پێشوو:

هەر سەد، بەڵکو هەر هەزار ناوە جوانە ڕووەو گەردوون ڕوانەکانی خواوەند، هەروەك بە بۆنەی دەرەوشانەوەیانەوە و بەهۆی ئاوێنەکانیانەوە کە بوونەوەرانن، خاوەنی خۆیان دەچەسپێنن، بە هەمان جۆر و بە چەشنێکی گومانبڕیش حەشر و ئاخیرەت دەچەسپێنن و دەری دەخەن.

❐ هەروەك خواوەندی پەروەردگارمان بەو هەموو فەرمانانەی کە لە کتێبەکانیدا ناردوونی و، بە هەموو ناوە جوانەکانی کە کردوونی بە ناوی خۆی، وەڵامی ئەم پرسیارەی لە بارەی دواڕۆژەوە داینەوە، هەر ئەو خواوەندە بە زمانی مەلائیکەتەکانیشی وەڵامان دەداتەوە و بە جۆرێکی تر قیامەتمان پێ دەناسێنێت. چونکە مەلائیکەتەکان پێمان دەڵێن:

(چەندین بەڵگە و نیشانەی لەڕادەبەدەر لەسەر بوونی ئێمە و جیهانی ڕۆحانی هەن. هەر لە سەردەمی ئادەمیشەوە - درو ودی لەسەر بێت - چەندین گفتوگۆ و ناسراوی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا ڕووی داوە. کە ئەمانەش چەند ڕووداوێکی یەقینیی وەهان هەرگیز گومان هەڵناگرن. هەردەم ئەو شتانەی کە لە هاتوچۆکانماندا بەناو مەنزڵگا و هۆڵەکانی بەهەشتدا دەیانبینین، لە کاتی بەیەك گەیشتنمان لەگەڵ پێغەمبەرەکانتاندا - درودیان لەسەر بێت - باسمان کردوون و، هەر باسیشیان دەکەین و، دەیانگێڕینەوە و دەڵێین: مزگێنییەکی بێ گومانتان دەدەینێ کە ئەم کۆشك و تەلارە هەمیشەیی و جێگا ئامادەکراوانە بۆ پێشوازی لێکردنی چەند میوانێکی تایبەتی ئازیز ئامادە کراون).

بەمەش، مەلائیکەتە بەڕێزەکان، وەڵامی پرسیارەکەمان لە بارەی ئاخیرەتەوە دەدەنەوە.

❐ پاشان بەدیهێنەرمان گەورەترین و تەواوترین مامۆستا و، ڕێکترین و ڕاسترین پێشەوا و ڕابەری بۆ داناوین کە حەزرەتی محەممەدە ﷺ. خواوەند ناردوویەتی و کردوویەتی بە دواهەمین پێغەمبەری بەڕێزی خۆی. کەواتە دەبێ پێش هەموو شتێك ئەو پرسیارەی لە بارەی ئاخیرەتەوە لە بەدیهێنەری خۆمانمان کرد، لەو مامۆستایەشی بکەین. تاکو لە زانینەکەماندا بەرەو تەواوکاری بڕۆین و، لە پلەی "علم الیقین"ەوە بەرەو "عین الیقین" و "حق الیقین" سەربکەوین و بەرز ببینەوە..

چونکە هەروەك خودی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویست و ئازیز و ڕاستگۆیەی ﷺ کە لە لایەن خوای گەورەی زانا و پەروەردگارەوە بە هەزار موعجیزە تەسدیق کراوە، بوو بە موعجیزەی قورئان و، بۆ هەموو جیهانی چەسپاند کە قورئان کتێبی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە و، هیچ ناڕەوایی و ناحەقێك

لە هیچ لایەکەوە توخنی ناکەوێت، هەر بەو جۆرە قورئانیش بوو بە یەکێك لە موعجیزەکانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ و، بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە ڕاستگۆیە و لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە تەسدیق کراوە.

جا ئەم دوو موعجیزەیە، کە یەکەمیان جیهانی زمانی بینراو(عالم الشهادة)ە و، تەسدیقی هەموو پێغەمبەران - دروودی خوایان لەسەر بێت- و گشت پیاوچاکانی لەگەڵدایە و.. ئەوی تریشیان کە زمانی جیهانی پەنهان(عالم الغیب)ە و، ناوەرۆکی سەرجەم کتێبە ئاسمانییەکانی تر و هەموو ڕاستییەکانی گەردوونی تێدا کۆکراوەتەوە..

ئەم دوو موعجیزەیە، بە درێژایی ماوەی ژیانی یەکەمیان و، هەزاران ئایەتی دووهەمیان و، بە چەشنی ڕووناکیی ڕۆژ، بەڵگەی ڕوون و بەهێزیان لەسەر ڕاستیی حەشر و نشوور هێناوەتەوە.

لە ڕاستیدا مەسەلەی حەشر و دواڕۆژ یەکێکە لەو مەسەلانەی کە لە سەرووی وزە و سنووری ژیریی مرۆڤەوەن و، بە فێرکاری و ڕابەریی ئەم دوو مامۆستا موعجیزەیە نەبێت (واتە: قورئانی پیرۆز و پێغەمبەر ﷺ) هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت پەیی پێ ببات.

ئەوەش کە ئایا بۆچی پێغەمبەرانی پێشوو - درووودیان لەسەر بێت- مەسەلەی حەشریان بۆ نەتەوەکانی خۆیان وەکو ئەوەی لە قورئاندایە ڕوون نەکردووەتەوە؟ لەبەر ئەوەیە کە سەردەمی ئەوان سەردەمی ساوایی و ژیانی دەشتەکییانەی مرۆڤایەتی بووە. دیارە لە قوتابخانەی سەرەتاییدا ڕوونکردنەوەکان زۆر پوخت و کورت دەبن!

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:**

مادەم زۆربەی "ناوە جوانەکان"ی خوای گەورە داخوازی قیامەتن و بەڵگەن لەسەری، ئەوا هەموو ئەو بەڵگانەی کە هی ئەو ناوە جوانانەن، لە هەمان کاتدا بەڵگەشن لەسەر چەسپاندن و بەرپابوونی ئاخیرەت.

مـادەم "مەلائیکەتـەکان" هـەواڵی مـەنزڵگاکانی ئاخـیرەت و جیـهانی هەمیشەییمان دەدەنێ. ئەوا ئەو بەڵگانەش کە لەسەر بوونی مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانی و پەرستنەکانیان هەن، دەبنەوە بە بەڵگە لەسەر چەسپاندنی ئەو جیهانەی تر.

مادەم گرنگترین شتێ کـە "حـەزرەتی محەمـەد ﷺ" لـە ماوەی ژیانە پاك و پیرۆزەکەیدا ڕایگەیاندووە و بناغەی بانگەوازەکـەی، لـە دوای مەسـەلەی "یەکتایی" خواوەند مەسـەلەی "ئاخیرەت" بووە، ئەوا هەموو ئـەو موعجیزە و بەڵگانەش کە لەسەر پێغەمبەریێتی و ڕاستگۆییەکەی هەن، دەبنەوە بە بەڵگـە و شایەت لەسەر ڕاستی هاتنی قیامەت.

مـادەم چواریەکی "قورئـانی پـیرۆز" لـە حەشـر و ئاخـیرەت دەدوێـت و دەکۆڵێتەوە و، بە هەزاران ئایەت هـەواڵی هاتنەدیی قیامەت ڕادەگەیەنێت و بەڵگـەی لەسـەر دەهێنێتـەوە، ئـەوا ئـەو هـەموو شـایەتی و بەڵگانـەش کـە دەیچەسپێنن قورئان حەقە و نێرراوی خواوەنـدە، دەبنەوە بـە شـایەت و بەڵگە لەسەر هاتنەدیی ئاخیرەت.

بەم جۆرە، سـەرنج لـەم پایـە گەورەیـەی ئیمـان بـدەن، تـاکو بزانـن چـەندە "ئیمـان بـە دواڕۆژ" بـێ گومانـە و، تـا چ ڕادەیـەك چەسـپاو و مەحکـەم و ڕەگداکوتاوە!

* * *

## پوختەی مەسەلەی هەشتەم:

### ـــــــــــــــــــ سوودی باوەڕ بە "ڕۆژی دوایی" بۆ بەختەوەریی دنیا

لە "مەسەلەی حەوتەم"دا ویستمان باسی "حەشر" لە ڕێی پرسیار کردنەوە لە چەند مەقامێکی زۆر، ڕوون بکەینەوە. بەڵام وەڵامی خوای گەورە بەهۆی "ناوە جوانەکان"یەوە سەروزیاد بوون و، دڵنیایی بێ گومان و تەواویان پێ بەخشین و، پێویستیان بە پرسیار کردنی تر نەهێشتین. لەبەر ئەوە، لەوێ تەنها بەو چەسپاندنە وازمان لەو باسە هێنا.

بەڵام لەم مەسەلەیەدا پوختەی یەکێك لەو سەدان بەروبووم و سوود و ئاکامانە باس دەکەین کە "ئیمان بە دواڕۆژ" دەیانهێنێتەدی. ئەوانەش هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ بەختەوەریی مرۆڤ لە دواڕۆژدا و، هەندێکی تریشیان دەگەڕێنەوە بۆ بەختەوەریی لەم دنیادا.

سەبارەت بەو بەروبوومانەی کە سەر بە بەختەوەریی دواڕۆژن، ئەوا قورئانی پیرۆز ڕوونی کردوونەتەوە و پاش قورئانی پیرۆز پێویست بە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی تر ناکات. ئەو کەسەی دەیەوێت ئەو بەروبوومانە بزانێت، با بگەڕێتەوە بۆ خزمەت قورئانی پیرۆز.

هەرچی ئەو بەروبوومانەشە کە دەگەڕێنەوە بۆ "بەختەوەریی ئەم دنیای مرۆڤ" ئەوا (پەیامەکانی نوور) ڕوونیان کردوونەتەوە.

وا لێرەدا بە کورتی چەند ئاکامێك لە نێوان سەدان ئاکامدا باس دەکەین کە "ئیمان بە دوارۆژ" بۆ مەبەستی بەختەوەرکردنی مرۆڤ لە ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتیدا، بەرهەمیان دەهێنێت:

❑ بەروبوومی یەکەم:

هەروەك مرۆڤ – بە پێچەوانەی ئاژەڵ – لەگەڵ ماڵەکەیدا پەیوەندیدارە، هەر بەو جۆرە پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ دنیاشدا هەیە..

هەروەك بەهۆی چەند هۆکار و پەیوەندییەکەوە پەیوەستەی خزم و کەسوکاریەتی، هەر بەو جۆرەش خاوەنی نەسەبێکی سروشتییە لەگەڵ نەژادی مرۆڤایەتیدا..

هەروەك حەز لە مانەوە لە دنیای فانیدا دەکات، حەزیش لە مانەوەی ناو ئەودنیای هەمیشەیی دەکات..

هەروەك بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی گەدەی بۆ خۆراك هەوڵ و تەقالا دەدات، هەر ئەو مرۆڤەشە کە لەبەر ئاوات و داخوازییەکانی، کە بەختەوەریی هەمیشەیی نەبێ هیچ شتێك تێریان ناکات، ناچارە تەنانەت هەوڵیش دەدات خۆراکی ژیری و دڵ و گیان و مرۆڤایەتییەکەشی دابین بکات و، لەسەر ئەو سفرە و خوانانەی کە بە فراوانیی دنیا، بەڵکو بە فراوانیی "ئەبەد" ڕاخراون، هەڵیان بگرێت و نۆشیان بکات.

جارێکیان لە کاتی منالیمدا – هەروەك لە پەیامی حەشردا ئاماژەی بۆ کراوە – لە ئەندێشەی خۆمم پرسی:

(کام لەم دوانەت بەلاوە باشترە: تەمەنێکی پڕ بەختەوەریت لەگەڵ دەستەڵاتداری و خۆشیی دنیادا ببێت، بەڵام بە نەمان و نەبوون کۆتایی پێ بێت.. یان بە هەمیشەیی بمێنیتەوە لەگەڵ ژیانێکی ئاسایی سەختدا)؟!

سەیرم کرد حەز لە دووهەم دەکات و بێزاری لە یەکەم دەردەبڕێت و دەڵێت:

(من "نەبوون"م ناوێت، بەڵکو مانەوەم دەوێت با لە دۆزەخیشدا بێت)!

جا مادەم هەرچی تام و لەزەتی دنیا هەیە "ئەندێشە" تێر ناکات، لە کاتێکدا کە "ئەندێشە" تەنها یەکێکە لە خزمەتگوزارانی ماهییەتی مرۆڤ، ئەوا دەبێ ماهییەتی مرۆڤ، کە ڕاستی‌یەکی گشتی‌یە، هەر بە سروشت پەیوەندیی بە نەمری و مانەوە و هەمیشەییەوە ببێت.

کەواتە دەبێ "ئیمان بە دواڕۆژ" گەنجینەیەکی چەندە گەورە بێت بۆ ئەو مرۆڤەی کە پەیوەندیی هێندە توندوتۆڵی بەم حەز و ئاواتە بێ کۆتاییەوە هەیە و، لەو لایشەوە بەشێکی "جوزئی ئیختیاری" نەبێ هیچی تر شك نابات و، لە هەژاری‌یەکی ڕەهادا دەتلێتەوە؟ دەبێ ئەم ئیمانە جەمسەرێکی چەندە گرنگ بێت بۆ ئەو بەختەوەری و لەزەتەی کە لە حەزی مرۆڤدایە و، چەندە سەرچاوەیەکی گەورە و خولگەی یارمەتیدان و دڵدانەوەی مرۆڤ بێت، لە بەرامبەر ئەو خەم و پەژارە لەژمارەبەدەر و لە بن نەهاتووانەی ژیانی دنیای؟

جا ئەگەر مرۆڤ لە پێناوی دەستخستنی ئەم هەموو سوودانەدا هەموو ژیانی بەخت بکات، هێشتا هەر کەمە.

❑ **بەروبوومی دووهەم:**

کە بەروبوومێکە ڕووی لە ژیانی کەسیی مرۆڤە.

ئەو شتەی کە ژیانی مرۆڤ لێڵ دەکات و دەیخاتە پەشێوی‌یەوە، بیرکردنەوەی بەردەوامیەتی لە دواڕۆژ و چۆنێتیی ڕۆشتنیەتی بۆ ناو گۆڕ. هەروەها بیرکردنەوەیەتی لەو ئەنجامەی کە هەموو خزم و خۆشەویستانی پێی گەیشتن.

ئەو مرۆڤە هەژارەی کە گیانی خۆی لە پێناوی هاوەڵێکی ئازیزدا بەخت دەکات، کاتێ بیر دەکاتەوە لەوەی کە: هەزاران بەڵکو ملیۆنان برای مرۆڤی

لە ڕێی مردنەوە بە نەمان کۆتاییان پێ دێت و، پاش ئەو جودابیە ئیتر یەك ناگرنەوە و بە یەکتر شاد نابنەوە؛ بێ گومان ئەم چەشنە بیرکردنەوەیەی مرۆڤی هەژار، ئازارێکی سەختی وەکو ئازاری دۆزەخی دەرخوارد دەدات.

لەم کاتەدا کە ئەو مرۆڤە بە ئازاری ئەم بیرکردنەوەیەوە دەتلێتەوە، "ئیمان بە دوارۆژ" دێت و پەردە لەسەر ڕووی چاوەکانی لادەدات و، چاوی دڵی دەکاتەوە و پێی دەڵێت: "بڕوانە"..

ئەویش کە دەڕوانێت یەکسەر تام و لەزەتێکی وەکو هی بەهەشت دەچێژێت و هەستی پێ دەکات. چونکە لە ڕوانگەی ئەم ئیمانەوە ڕزگاربوونی هەموو خۆشەویستانی لە دەست مردنی هەمیشەیی و لەناوچوون و پرتووکان دەبینێت و، لەمەوە بۆی دەردەکەوێت کە ئەو خۆشەویستانەی، لە جیهانی ڕووناکیی هەمیشەییدان و چاوەڕوانی گەیشتنی ئەمن.

لێرەدا هەر هێندەی لەسەر دەڕۆین، چونکە "پەیامەکانی نوور" ئەم ئەنجامەیان بە بەڵگەکانیەوە ڕوون کردووەتەوە.

☐ **بەروبوومی سێهەم:**

کە دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی‌یەکانی مرۆڤ.

بەرزیی پلەی مرۆڤ بەسەر زیندەوەرانی تردا، تەنها لەبەر: ڕەوشتە بەرزەکانی و.. لێهاتنە سروشتی‌یە گشتی‌یەکانی و.. بەندایەتی‌یە هەمەکی‌یەکەی و.. فراوانیی بازنەکانی بوونیەتی.

لەبەر ئەمە، ئەو مرۆڤەی کە تەنها لە کاتی ئێستایدا دەژی و خۆی لە ڕابوردوو داماڵیوە و پەیوەندیشی لەگەڵ ئایندەدا پچڕاوە - کە ئەم ڕابوردوو و ئایندەیە سەبارەت بەو "نەبوو" و تاریکن - سەرجەمی ئەو ڕەوشتە مرۆڤانە و خۆشەویستی و برایەتی و مرۆڤایەتی‌یانەی بەدەستیان دەهێنێت تەنها

لەسەر بناغەی "ئێستا" بەرتەسکەکەی و، بە گوێرەی تەرازووە سنووردارەکانی کاتی "ئێستا"ی دەبن. ئیتر بەپێی ئەو تەرازووە بچووك و تەسکانە باوك و برا و خێزانی خۆی خۆش دەوێت. وەك بڵێی زووتر نەیناسیبن و لە ئایندەشدا نەیانبینێتەوە!

کەواتە - بەم پێیە - وەفای ئەو مرۆڤە هەرگیز ناگاتە پلەی ڕاستی و، برادەرییەکەشی دڵسۆزیی تێدا نابێت و، خۆشەویستییەکەشی لە خڵتە پاك نابێتەوە و، خزمەتگوزارییەکانیشی ناگەنە پلەی ڕێزلێگرتنێکی خاوێن و بێ مەبەست. چونکە فراوانیی ئەو ڕەوشتانە، بە هەمان ڕێژە، تەسك و بچووك بوونەتەوە! ئیتر ئەو مرۆڤە بەرەو پلەی نەفامترین ئاژەڵ دەڕوات و نزم دەبێتەوە.

بەڵام هەر کات "ئیمان بە دواڕۆژ" بۆ یارمەتی بە هانای ئەم مرۆڤەوە بێت، ئەوا ئەو "کات"ە تەسکە گۆڕئاسایەی بۆ دەگۆڕێت بە کاتێکی ئەوەندە فراوان کە ڕابوردوو و ئایندەش بگرێتەوە..

ئیتر مرۆڤ بەپێی داخوازیی ئەو باوکێتییەی کە تا ژیانی بەختەوەری و جیهانی بەرزەخ بەردەوام دەبێت، ڕێز لە باوکی خۆی دەگرێت و، هەر بەو بیرکردنەوەیەش یارمەتیی براکەی دەدات کە دەزانێت برایەتییەکەیان تا "ئەبەد" بەردەوامە و، خێزانەکەشی خۆش دەوێت و یارمەتیی دەدات و لەگەڵیدا نەرمونیان دەبێت، چونکە دەزانێت ئەم خێزانەی جوانترین هاوەڵی ژیانی بەهەشتی دەبێت، ئەم بازنە فراوانەی ژیانی دنیا و، پەیوەندی و خزمەتگوزارییە گرنگەکانیشی ناکات بە هۆکارێك بۆ چەند ئیشوکارێکی بێ نرخی دنیایی و سوود و مەبەستی کەم نرخی دنیا!

ئیتر ئەم مرۆڤە: برادەریی ڕاستەقینە و، وەفای خاوێن و، دڵسۆزیی تەواوی لە هەموو پەیوەندییەکانیدا دەست دەکەوێت. ئنجا ئاکارە تەواوەکان و

ڕەوشتە ئادەمی‌یەکانیشی، بە هەمان ڕێژە، سەر دەکەون و بەرز دەبنەوە. دیارە هەرکەسەو بە گوێرەی پلەی ئیمانەکەی خۆی.

جا ئەم مرۆڤەی کە زووتر لە چێژی ژیاندا نەدەگەیشتە ئاستی چۆلەکەیەك، ئێستا بەهۆی "ئیمان بە دوارۆژ"ەوە بووە بە کەسێکی بەختەوەر و میوانێکی بەڕێز و، بەدیهێنراوێکی سەرکەوتوو لە دنیادا و، پلەی بەسەر هەموو زیندەوەراندا بەرز دەبێتەوە، تەنانەت دەبێتە خۆشەویستترین بەدیهێنراوی خوای گەورە و، بەڕێزترین بەندە لە لای خاوەن و پەروەردگاری بوونەوەر.

لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ئەنجامە، هەر هێندەمان نووسی. چونکە پەیامەکانی نوور بە چەندین بەڵگە ئەمەیان ڕوون کردووەتەوە.

❑ سوودی چوارەم:

کە ڕووی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤە.

"تیشکی نۆهەم" ئەم سوودەی ڕوون کردووەتەوە، کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

* (منالآن) کە چواریەکی گرۆی مرۆڤ دەبن، بە بێ "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" ناتوانن وەکو مرۆڤێکی ڕێکوپێك و خاوەن هەست و سۆزی مرۆڤانە بژین..

چونکە ئەگەر ئەم ئیمانە نەبوایە، ئەوا ناچار دەبوون ژیانێکی دوور لە ڕەفتاری جوان و پڕ لە پەژارە و ئازار و ناڕێکی بەسەربەرن و، هیچ دڵنەوایی و تام و چێژێك لە یاری و گاڵتەوگەپیان وەرنەگرن، چونکە ئەو مردنەی کە تووشی منالەکانی دەوروبەریان دەبێت، کاریگەری‌یەکی گەلێ بەسوێ و قووڵ لە دڵ و دەروون و هەستی ناسکی ئەواندا بەجێ دەهێڵێت. ئەو دڵەی کە لە ئایندەدا بە چەندین هیوا و ئارەزوو و ئاواتی زۆر پڕ دەبێت و،

لە گیانیشیدا کە توانای خۆڕاگرتنی نابێت. لە ئەنجامدا تووشی نیگەرانی و دوودڵی و سەرگەردانی دەبێت و، "ژیان" و "ژیری"ی دەبن بە دوو هۆکار بۆ ئەشکەنجە و ئازاردانی. ئنجا تاکو وەڵامی پرسیار و دوودڵییەکانیشی دەست نەکەوێت، هیچ کەڵك و سوودێك لەو گاڵتەوگەپ و یارییانەی کە خۆی پێیانەوە خەریك دەکات، وەرناگرێت.

بەڵام ڕێنمایی "باوەڕ بە ڕۆژی دوایی" وا لەم منداڵە دەکات کە لە دەروونەوە بەم جۆرە لەگەڵ خۆی بدوێت:

(هاوڕێکەم - یان براکەم - کە کۆچی دوایی کرد، ئێستا یەکێکە لە باڵندەکانی بەهەشت و، لە ئێمە زیاتر دڵخۆش و شادمانترە و لە گەڕان و هاتوچۆیشیدا لە ئێمە سەربەستترە. دایکیشم - هەرچەندە مردووە - بەڵام بەرەو میهرەبانیی فراوانیی خوای گەورە ڕۆشتووە و، لە بەهەشتدا من لە ئامێزی پڕ سۆزی میهرەبانیی خۆی دەگرێت و، لەوێ بە دیداری شاد دەبمەوە).

بەم جۆرە، ئەو منداڵە دەتوانێت بە ئارامی و دڵنیایی و ژیانێکی شایستەی مرۆڤ، بژی.

* هەروەها (پیران)یش کە چواریەکی گرۆی مرۆڤن، لە بەرامبەر ئەوەی کە لە ماوەیەکی نزیکدا چرای ژیانیان لێ دەکوژێتەوە و دەڕۆنە ژێر خاکەوە و، ئەم دنیا شیرین و جوانەش هەموو دەرگاکانی خۆی لە ڕوویاندا دادەخات.. لە بەرامبەر ئەمەوە، هیچ دڵنەواییەکیان دەستگیر نابێت جگە لە "ئیمان بە دواڕۆژ"!

چونکە ئەگەر ئەم ئیمانە نەبوایە، ئەو باوکە بەڕێز و خاوەن بەزەیی و دایکە خۆبەختکار و میهرەبانانە، گەلێ ئەشکەنجە و ئازاری یەك لە دوای یەکیان دەچەشت و لە بارێکی دەروونیی گەلێ ناهەموار و، دڵەتەپێ و بێ

ئارامی‌یەکی یەکجار دژواردا دەتلانەوە و، دنیایان وەك بەندیخانـە لـێ تەسك دەبووەوە و، ژیانیان بە تەواوی دەبوو بە ئازارێکی بەردەوام و لەتوانابەدەر.

بەڵام "ئیمان بە دوارۆژ" بانگیان دەکات و پێیان دەڵێت:

(پیران! خەفەت مەخۆن و زۆر گوێ بە پیری مەدەن.. چونکە لاوی‌یەکی هەمیشەییتان لـە بەردەمدایە کە بێ هیچ گومانێك پێی دەگەن و، ژیانێکی رووناك و تەمەنێکی درێژ چاوەڕوانتانـە و، بە منـاڵ و خزمانتـان کـە کۆچیـان کردووە شاد دەبنەوە و، کردەوە چاکەکانیشتان پارێزراون و پاداشتەکانیان وەردەگرن).

بەم چەشنە، "ئیمـان بـە ڕۆژی دوایی" دڵدانـەوە و دڵنـەوایی بـەو پیرانـە دەبەخشێت و، هێنـدە شـادمانیان دەکـات کـە ئەگـەر ئـەرکی قورسـی سـەد پیریشی لەسەر کۆڵ دابنرێت، بەوپەڕی ئارامی و بە ئومێد و چـاوەڕوانیی ئـەو ژیانە نەبڕاوە و پڕ لە بەختەوەری‌یەی دوارۆژ، هەموویان هەڵدەگرێت.

* هەروەها (لاوان) کە سێ‌یەکی گـرۆی مرۆڤـن، هـەندێ جـار گـوێ بۆ دەنگی ژیـری‌یـە ئـازاکانیان ڕاناگـرن. چـونکـە ئارەزووەکانیان هـــەردەم لـــە قولپـدان و هـەڵچـووندان و، لـــە بەرامبـــەر هەســت و ئارەزووەکانیانـــەوە دەستەپاچەن و هیچ کارێکیان پێ ناکرێت.

جـا ئەگـەر ئـەو لاوانـە "ئیمـان بـە دوارۆژ"یـان لـە دەسـت بچێـت و یـادی ئـاگری دۆزەخ نەکەنـەوە، ئـەوا مـاڵ و ئـابڕووی خـەڵکی و، حەوانـەوەی لاوازان و، ڕێزی پیران دەکەونە مەترسی‌یەوە. ئەو کاتەش دوور نی‌یـە یـەکێك لەو لاوانەی کە "ئیمان بە دوارۆژ"یـان لەدەسـت داوە، لـە پێنـاوی لـەزەتێکی کەمخایەندا بەختەوەریی ماڵێکی ئاسوودە و هێمن تێك بدات و لە پاشـاندا بـۆ چـەندین سـاڵ لـەم جـۆرە بەندیخانانـەدا سـزای کردەوەکـانی بچێژێـت و، لـە ئەنجامیشدا وەکو ئاژەڵێکی دڕندەی لـێ بێت.

بەڵام ئەگەر "ئیمان بە دواڕۆژ" یارمەتیی بدات و فریای بکەوێت، ئـەوا بـە زوویی ڕێگای ڕاست دەدۆزێتەوە و "ژیـری"ی دەکـات بـە ڕابـەری خـۆی و، لەبەر خۆیەوە بە خۆی دەڵێت:

(هەرچەندە لە بەرچاوی حکوومەت و پۆلیسەکانیدا نیم و نـامبینن، بـەڵام مـەلائیکـەتەکانی پادشـای هـەرە مـەزن و شـکۆمەند، کـە بەندیخانـەی هـەرە گەورە و هەمیشەیی دۆزەخی بە دەستە، دەمبینن و کـردەوە خراپەکانم لەسـەر تۆمار دەکەن. کەواتە من لـەم دنیایـەدا وەکـو ئـاژەڵێکی لـە پـەت بـەربوو نیـم تاکو هەر شتێك دەکەم بە سەربەستی بیکەم. بەڵکو میوانێکم کتوپڕ دەڕۆم و، بۆ ئەرك و فرمانێك هاتوومەتە دنیا. بێ هیچ گومانێك ڕۆژێك دێت کـە منیـش وەك ئەوان پیر و پەککەوتە و لاواز دەبم).

ئیتر ئـەو کاتـە لـە نـاخی دڵیـەوە هەسـت بـە سۆز و بـەزەیی و میـهرەبانی دەکات بە حاڵی ئەو پیر و لاوازانـە و، ڕێـزی ئەوانـە دەگرێـت کـە لـەوەوپێش دەیویست بە جۆرێکی ناڕەوا دەستدرێژی و ستەمیان بەرامبەر بنوێنێت.

لەبەر ئەوەی "پەیامـەکانی نـوور" ئـەم واتـا و مەبەستەیان بـە جوانـی ڕوون کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا بەم ئەندازەیە واز دەهێنین.

★ هەروەهـا (دەردەداران و، سـتەم لێکـراوان و، ئەوانـەی وەك ئێمـە هەژار و گیرۆدەی بـەڵان و بـەندکراون و، بـە سـزای سـەخت حوکـم دراون) هـەموو ئەوانـە، بەشـی هـەرە گرنگـی گـرۆی مـرۆڤ پێکدەهێنن. جـا ئەگـەر "ئیمان بە دواڕۆژ" یارمەتییان نەدات و، دڵی خۆیانی پێ نەدەنەوە، ئەوا:

ئـەو مردنـەی کـە بـەهۆی نەخۆشـییەکەیانەوە هـەردەم لـە بـەردەمیاندا ئامادەیە و هەستی پێ دەکەن..

هـەروەها ئـەو سـووکایەتی پێکردنـەی کـە لـە ستەمکارانەوە دەیبینـن، بـێ ئەوەی بتوانن تۆڵـەی خۆیانیـان لـێ بکەنـەوە، یـان ئـابڕووی خۆیـان لـە ژێـر زەبروزەنگ و چنگ و دەنووکی ئەو ستەمکارانە دەرباز بکەن..

هەروەها ئەو نائومێدی‌یە پڕ لە ئازارەی کە بەهۆی لەدەستچوونی منداڵ و سامانیان لە ڕووداوە ناهەموارەکاندا، پەیدا بووە..

ئەو دڵتەنگی‌یە توندوتیژەی ساڵەهای ساڵی مەینەت و ئازار و ئەشکەنجەی بەندیخانە، کە لە ئەنجامی لەزەتێکی خێرای ماوەی چەند خولەك و سەعاتێکەوە هاتووەتە ڕێیان..

بێ گومان هەموو ئەم شتانە، دنیا بۆ ئەو لێقەوماوانە دەکات بە زیندان و بەندیخانەیەکی گەورە و، سەرانسەری ژیانیشیان لێ دەکات بە ئازار..

بەڵام هەر هێندەی "ئیمان بە دوارۆژ" بە هانایانەوە دێت و دڵنەواییان پێ دەبەخشێت، ئەوا یەکسەر دڵیان دەکرێتەوە و هەناسەی ئاسوودەیی هەڵدەکێشن..

چونکە ئەو ئیمانە، چ بە تەواوی چ بە جۆرێکی هەندەکی و، هەر کەس بە گوێرەی پلەی ئیمانی خۆی، دڵتەنگی و نائومێدی و دوودڵی و نیگەرانی و ڕقی تۆڵەسەندنەوەی لە دڵدا لادەبات و، دڵخۆشی و شادمانیی پێ دەبەخشێت. بە ڕادەیەکی وا کە دەتوانم بڵێم: ئەگەر "ئیمان بە دوارۆژ" نەبوایە کە بە هانای خۆم و برایانمەوە هات لەم موسیبەتە سامناك و بەندبوونەی ئێستاماندا – بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیشمان کردبێت – ئەوا هەر تەنها ئازاری یەك ڕۆژمان مردنێك دەبوو بۆ خۆی و، ئەم گرفتە وای لێ دەکردین کە بە جارێ پشت لە دنیا هەڵبکەین و وازی لێ بهێنین.

بەڵام سوپاسی لە سنووربەدەر و بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە کە وای لێ کردم بە بۆنەی ئەو ئیمانەوە پەژارە و ئازاری خۆم و ئەو برا زۆرانەشم کە لە خۆم خۆشترم دەوێن و، لەدەستچوون و زایە بوونی هەزاران "پەیامی نوور" کە لە چاوم بەلامەوە ئازیزترن و، فەوتانی بەشێکی زۆری کتێبە جوان و هەرە بەنرخەکانم.. هەموو ئەو پەژارە و ئازارانە هەڵبگرم، هەرچەند لەوەوپێش ئیهانە و خۆهەڵقورتاندنی هیچ کەسێکم قبووڵ نەدەکرد..

بەڵام ئێستا - بۆ ئەوەی دڵنیا بن - سوێندتان بۆ دەخۆم کە ڕووناکی و هێزی "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" ئارامی و، خۆڕاگری و، دڵنەوایی و، دامەزراوی و، تاسەیەکی وای بۆ دەستخستنی پاداشتی جیهادێکی گەورە لەم تاقیکردنەوەیەدا پێ بەخشیم کە خۆمم وەك قوتابییەك دەهاتە بەرچاو لە قوتابخانەیەکدا کە سەرانسەری جوانی و خێر و خۆشییە و، پڕ بە پێستی خۆیەتی ناوی "قوتابخانەی یووسفی"ی لێ بنرێت، وەك لە سەرەتای ئەم پەیامەدا ئەو ناوەمان لێ نا..

خۆ ئەگەر نەخۆشی نەبوایە کە جار بەجار تووشم دەبوو، هەروەها ئەو بێ تاقەتییەش نەبوایە کە بەهۆی پیرییەوە سەری تێدەکردم، ئەوا لەگەڵ ئەو دڵنیایی و ئاسوودەیی دەروونەی کە بەهۆی ئیمانەوە بەدەستم هێنا، بە لێبڕانێکی زۆرترەوە تێدەکۆشام وانەکانم لەم قوتابخانەیەدا بخوێنم.

بە هەر حاڵ، لە مەبەست لامان دا و، داوای لێبوردن دەکەم لەسەر ئەم درێژەپێدانە.

★ هەروەها (ماڵی هەموو مرۆڤێك) دنیا بچووکەکەی، بەڵکو بەهەشتە بچووکەکەیەتی..

جا ئەگەر "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" تیایدا زاڵ نەبێت و باڵی خۆی بەسەر بەختەوەریی ئەو ماڵەدا ڕانەکێشابێت، ئەوا هەموو ئەندامێکی ئەو خێزانە سەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێوانیانەوە، دووچاری نیگەرانییەکی ئاوێتەی ئازار و ئەشکەنجەیەکی دژوار دەبێت، ئەمەش بە ئەندازەی پلەی ئەو خۆشەویستی و دڵسۆزی و میهرەبانییانەی کە لە نێوان کەسانی ئەو خێزانەدایە. ئیتر ئەو بەهەشتەیان لێ دەبێت بە دۆزەخێکی وا کە گوزەرانی تێدا سەخت و ئەستەم بێت، دوور نییە لەتاو ئەو بارە ناهەموارە ژیریی خۆی بەنج بکات و پەنا بەرێتە بەر کاری هەرزە و کاتی. لەمەشدا وەکو وشترملی

لێ دێت کە کاتێ ڕاوچی دەبینێت سەری خۆی لەناو لمدا دەشارێتەوە تاکو ڕاوچی نەیبینێت! چونکە توانای فڕین و ڕاکردنی نییە. ئەمیش وەکو ئەو وایە؛ سەری خۆی نوقمی بێ ئاگایی دەکات، گوایا بۆ ئەوەی مردن و جودایی و نەمان نەیبینن! بەم چەشنە بیرکردنەوە گێلانەیە هەستی خۆی لەکار دەخات، وەکو بڵێیت چارێکی بۆ ئازارەکانی خۆی دۆزیبێتەوە!

بۆ نموونە: "دایك" کە خۆی لە پێناوی منداڵەکەیدا بەخت دەکات، هەرکات منداڵەکەی ببینێت دووچاری مەترسییەك ببێت، ئەوا لە تاوا دەکەوێتە ترس و لەرزەوە..

هەروەها "منداڵەکان" کە لە کاتی بەڵا و گیروگرفتە نەبڕاوەکانی دنیادا هەست دەکەن توانای ڕزگارکردنی دایك و باوك و برایانیان نییە، ئەوا لە خەفەت و دڵتەنگیی ئەوەدا دەمێننەوە کە هیچیان پێ نەکراوە..

بەم جۆرە و وەك ئەم نموونانەی باسمان کردن، ژیانی ئەم خێزانەی کە وا دەزانرێت بەختەوەرە، لەم دنیا ئاڵۆز و فانییەدا بەختەوەرییەکەی لەدەست دەدات. چونکە پەیوەندیی خزمایەتی و کەسایەتیی نێوان یەك بە یەکی ئەندامانی خێزانی وەها، لە ژیانێکی تەواو کورتی وەك ژیانی دنیادا، هەرگیز هاوڕێیەتیی ڕاستەقینە و، وەفای بێگەرد و، دڵسۆزیی تەواوەتی و، خۆشەویستیی پاك و بێگەردیان پێ نابەخشێت، بەڵکو بە ڕێژەی کورتیی ئەم ژیانەی دنیا ڕەوشتەکانیش بچووك دەبنەوە و، دەچنەوە یەك، لەوانەشە هەر بە تەواوی نەمێنن.

بەڵام هەر ئەوەندەی کە "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" ئەو ماڵە بەسەر بکات، ئەوا یەکسەر هەموو شوێن و سووچ و لایەکی ئەو ماڵە ڕووناك و ئاوەدان دەکاتەوە. چونکە ئەو کاتە پەیوەندییەکانی خزمایەتی و کەسایەتی و میهرەبانی و خۆشەویستیی ناو ئەو ماڵە، لە چوارچێوەی ژیانێکی کورتدا لێك نادرێتەوە و پێیەوە نابەسترێتەوە، بەڵکو بە چەند پەیوەندییەکی وا

دەپێورێن و لێکدەدرێنەوە کە هەر لە دنیاوە تا دەگاتە نەمری و مانەوە و بەختەوەریی هەمیشەیی لەودنیادا، درێژەی هەیە و بەردەوامە.

ئیتر هەریەك لەو خێزان و خزمانە ڕێزی بێگەردی ئەوانی تر دەگرێت و، بە چەشنێکی خاوێن خۆشی دەوێن و، میهرەبانییەکی ڕاست و برادەرییەکی بەوەفا و ئەمەکداریان لەگەڵدا دەنوێنێت و، چاو لە کەمتەرخەمییان دەپۆشێت. لە ئەنجامی ئەمەشدا ڕەوشتی مرۆڤانەیان بەرز دەبێتەوە و، بەختەوەریی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی لەوماڵەدا ڕەنگ دەداتەوە.

"پەیامەکانی نوور" ناوەرۆکی ئەمەیان ڕوون کردووەتەوە. لەبەر ئەوە، لێرەدا هەر ئەوەندەی لێ دواین.

* هەر بەم جۆرە هەموو (شار)ێك خۆی لە خۆیدا ماڵێکی فراوانی دانیشتووانیەتی..

جا ئەگەر "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" بەسەر یەك بە یەکی ئەم خێزانە مەزنەدا زاڵ نەبێت، ئەوا لە بریی بناغەی ڕەوشتە بەرزەکانی وەك: دڵسۆزی و، پیاوەتی و، چاکە و، خۆشەویستی و، خۆبەختکردن و، ڕەزامەندیی خوا و، پاداشتی دوارۆژ.. لە بریی ئەمانە، ڕق و، بەرژەوەندیی کەسی و، فرتوفێڵ و، خۆپەرستی و، تەکەللوف و، ڕیا و، بەرتیل و، فێڵ و تەڵەکەبازی بەسەریاندا زاڵ دەبێت و، هەموو ناوەرۆکێکی: تۆقاندن و، بەرەڵایی و، دڕندەیی بە ناوی ئەو یاسا و ڕێسا و ئاسایش و مرۆڤایەتییەی کە بە دەم دەریدەبڕن، فەرمانڕەوا و دەستەڵاتدار دەبێت! دیارە ئیتر ژیانی ئەو شارە ژەهراوی دەبێت و، مناڵان بێ ئەدەب و بەرەڵا دەبن و، لاوانیش دووچاری مەستی و سەرخۆشی دێن و، بەهێزانیش دەست بە ستەمکاری و دەستدرێژی دەکەن و، پیرانیش هەر خەریکی گریان و فرمێسك هەڵڕشتن دەبن!

★ هەر بەم جۆرە، (وڵات)یش بە گشتی ماڵێکی گەورەی فراوانە و، "نیشتمان"یش ماڵی خێزانی نەتەوەیە..

جا ئەگەر "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" فەرمانڕەوا و دەمڕاستی ئەو ماڵانە بێت، ئەوا هەرچی ڕەوشتی بەرز هەن هەموویان بە ڕوونی و درەخشانی دەردەکەون..

واتە ئەو کاتە: ڕێز لێگرتنی یەکتری و، میهرەبانیی ڕاستەقینە و، خۆشەویستیی بێگەردی بێ بەرامبەر و، یارمەتی و، خزمەتگوزاریی بێ فرتوفێڵ و، تێکەڵی و چاکەکاریی بێ مەرایی و، چاکە و ڕێزگرتنی بێ خۆبەگەورەزانی و، هەموو ڕەوشت و کردەوە چاکەکانی تر، دەردەکەون و بڵاو دەبنەوە. چونکە ئەو کاتە ئیمان بانگی "منداڵان" دەکات و پێیان دەڵێت:

(واز لە بێ ئەدەبی و بەرەڵایی بهێنن، چونکە بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتتان لە بەردەمدایە.. خۆتان بە گاڵتەوگەپەوە خەریك مەکەن و ئەو بەهەشتە لە کیسی خۆتان مەدەن).

بەم جۆرە و بەهۆی ڕێنمایی قورئانەوە ڕەوشتی ئەو منداڵانە دادەمەزرێت.

بە "لاوان"یش دەڵێت:

(ئاگری دۆزەختان لە پێشدایە.. واز لە سەرخۆشی و مەستی بهێنن).

بەم جۆرە دەیانگێڕێتەوە بۆ لای ژیری و هۆشی خۆیان.

بە "ستەمکار"یش دەڵێت:

(وریابە! ئازارێکی سەخت تووش دەبێت).

بەمەش دەستی لە ستەم پێ هەڵدەگرێت و دەیگێڕێتەوە بۆ دادگەری..

بە "پیران"یش دەڵێت:

(مژدە بێت! لاوییەکی هەمیشەیی و جوانتان لە ڕێدایە و، بەختەوەرییەکی بەردەوامیش لە دوارۆژدا چاوەڕوانتانە کە زۆر لەو

بەختەوەرییانەی لە کیستان چووە بەرز و بەنرخترە. کەواتە هەلێکە و لە دەستی مەدەن و هەوڵ بدەن فریای بکەون).

بەم جۆرە گریانەکەیان بۆ دەکات بە دڵخۆشی و شادمانی.

بەم پێیە و بەم جۆرەی کە باسمان کرد:

"ئیمان بە ڕۆژی دوایی" کاریگەریی خاوێن و تیشکی ڕووناکیی خۆی بۆ هەموو دەستە و کۆمەڵ و تاقمێکی گشتی و تایبەت و هەمەکی و هەندەکی و کەم و زۆر، دەنێرێت و بۆیان ڕەوانە دەکات.

دەبا گوێی زانایانی ڕەوشت و کۆمەڵناسی لەوانەی کە بایەخ بە کاروباری مرۆڤ دەدەن، بزرنگێتەوە و گوێ بۆ ئەمە ڕابگرن!!

جا ئەگەر ئەم سوودانەی "ئیمان بە دواڕۆژ" کە ئێستا باسمان کردن لەگەڵ ئەو سوودانەی کە ماون، پێکەوە گرێ بدرێن، ئەوا هەموو کەسێك بە ڕوونی و بێ گومانی تێدەگات کە:

تەوەرەی بەختەوەریی هەردوو دنیا لە هەردوو ژیاندا تەنها هەر "ئیمان"ە!

* * *

لە "وتەی بیست و هەشتەم" و پەیامەکانی تری نووردا، چەندین وەڵامی گەلێ بەهێز بۆ چەند گومانێکی بێ نرخ دراوەتەوە سەبارەت بە (حەشری جیسمانی) واتە: زیندووکردنەوەی جەستەی مردووان. بەڵام لێرەدا بە کورتی ئاماژەیان بۆ دەکەین و، دەڵێین:

زۆربەی ناوە جوانەکانی خواوەند لە شتانی جیسمانی (واتە: ماددە هەست پێ کراوەکان)دا دەدرەوشێنەوە. کەواتە ئەو ماددانە لە هەموو ئاوێنەیەك زیاتر ئەو ناوانەیان تێدا دەردەکەوێت..

ئەوپەڕی ئامانج و مەبەستەکانی خواوەند لە بەدیهێنانی بوونەوەراندا لە (جیسمانییەکان)دا دەردەکەوێت. چونکە ئەو ماددە بەرجەستانە چڕترین و

دەوڵەمەندترین و کارامەترین مەڵبەندی دەرکەوتنی ئەو ئامانجانەی خواوەندن..

زۆرینەی چاکەکاری و نیعمەت و بەخششە زۆر و گشتییەکانی پەروەردگار لە (جیسمانییەکان)دا دەردەکەون..

زۆربەی تۆوی نزا و پاڕانەوەکانی مرۆڤ کە بە زمانی پێویستییەکانی لە دەرگانەی خوادا دەیانکات و، زۆربەی ڕەگ و بنج و بناغەی شوکرانە و ستایشەکانیشی کە پێشکەشی بەدیهێنەریان دەکات، لە شتە ماددییە بەرجەستە و هەست پێ کراوەکان (واتە: جیسمانییەکان) هەڵقوڵاون و پەیدابوون و دەرچوون..

زیاترین جۆری تۆوەکانی جیهانی "مەعنەوییات و ڕۆحانییات"، بە هەمان جۆر، لە شتە جیسمانییەکاندان.

بەم پێیە:

شتانی ماددیی بەرجەستە و هەست پێ کراو، سەدان ڕاستیی هەمەکییان تێدا کۆکراوەتەوە. لەبەر ئەوە، خواوەندی بەدیهێنەر ماددە جیسمانییەکان لەسەر ڕووی زەویدا زۆر دەکات، تاکو ئەو ڕاستییە باسکراوانەیان تێدا دەربکەوێت. ئیتر بەم چەشنە و لەوپەڕی خێرایی و بە کارایییەکی سەرسووڕهێنەر ئەو پەروەردگارە "بوون" بە بوونەوەران دەبەخشێت و، کاروان لە دوای کاروان بۆ پیشانگای ئەم جیهانەیان دەنێرێت و، پاشان کار و ئەرکیان پێ تەواو دەکات و، بە بەردەوامی بوونەوەرانی تریان بە دوادا دەنێرێت..

بەم جۆرە، مەکینەی بوونەوەران بە بەردەوامی دەخاتە کار و بەمەش بەرهەمی جیسمانی، بە هەمیشەیی، لەسەر ڕووی زەوی دەتەنێت و، زەوی دەکات بە کێڵگەی ئەودنیا و شەتڵگای بەهەشت. بە ڕادەیەکی وا کە

پەروەردگار بۆ ئەوەی گەدەی مرۆڤ دڵنیا بکات و بیخاتە شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاری و ڕەزامەندیەوە ئەوا گوێی لە دوعای زمانی حاڵی ئەو گەدەیە دەبێت کە بۆ مانەوەی خۆی دەیکات، ئنجا دوعاکەی گیرا دەکات و، لە ڕاستیشدا بەو خۆراکە بەتام و ورد و بەدیهێنراوە لە ژمارە بەدەرانەی کە بەدییان دەهێنێت و، بەدیهێنانی ئەو نیعمەتە بەنرخانەش کە سەدان و هەزاران جۆر و شێوە دەبن، داواکاری‌یەکەی بۆ جێبەجێ دەکات..

ئەمەش بە ڕوونی و بێ گومانی ئەوە دەردەخات کە زۆربەی جۆری لەزەتە ماددی و هەست پێ کراوەکانی بەهەشت "جیسمانی"ن و ئەو بەختەوەری‌یە هەمشەییەش کە هەموان داوای دەکەن، ئەویش هەر لە لایەنی جیسمانی‌یەوەیە.

جا ئایا هەرگیز دەگونجێ و دەچێتە عەقڵەوە یان ئایا هیچ گریمانێك لەوەدا هەیە کە خواوەندی بەتوانا و میهرەبان و زانا و بەخشندە هەردەم ئەو دوعایە گیرا بکات کە گەدەی ئاسایی بە زمانی حاڵ بۆ مانەوەی دەیکات و یەکسەر بڕوات بە دەمیەوە - بێ ئەوەی کە "ڕێکەوت" هیچ ڕۆڵێکی لەمەدا ببێت - ئەمەش بەو خۆراکە ماددی و هەست پێ کراوانەی کە لەوپەڕی وردەکاریدان، هەموویان بۆ گەدە دروست بکات و، بەم کارە ئەو گەدەیە ڕازی بکات..

کەچی هەر ئەم خواوەندە، چەندین نزا و پاڕانەوەی گشتی و لەبن نەهاتوو گیرا نەکات کە گەدەی گەورەی مرۆڤایەتی و سروشتی ڕەسەنی دەیکەن و، چەندین چێژ و لەزەتی ماددیی لە دواڕۆژدا پێ نەبەخشێت کە دڵی پێیان دەکرێتەوە و بە سروشت چاوەڕوانیانە و، تەنانەت دەیەوێت هەموو ئەوانەی لەودنیای هەمیشەیی و نەمریدا ببێت؟

ئایا دەگونجێ لە ڕاستیدا ئەو داواکاری‌یانە گیرا نەکات و، حەشری جیسمانی نەهێنێتەدی و، ئەم مرۆڤەی کە بەرهەمی بوونەوەران و جێنشینی خۆیەتی لە زەویدا و بەندەی بەڕێزیەتی، بە هەمیشەیی ڕازی نەکات؟

نەخێر.. نەخێر.. ئەمە ئەنجامێکی سەد لە سەد مەحاڵە و کارێکی بە تەواوی ناڕەوایە. چونکە چۆن دەکرێت ئەو خواوەندە ویزەی "مێش" ببیستێت، کەچی نەعرەتەی "هەور" نەبیستێ؟ چۆن چاودێریی کەرەسەی سەربازێکی ئاسایی دەکات، بەڵام گوێ بە سوپایەکی گەورە نادات؟

شتی وا کارێکی گەلێ ناڕەوایە و، خوای گەورەش کاری ناڕەوای لێ ناوەشێتەوە.

بەڵێ، ڕاشکاویی گومانبڕی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الأَنفُسُ وَتَلَذُّ الأَعْيُنُ﴾ (الزخرف: ٧١) ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە زۆربەی ئەو لەزەتە ماددی‌یانەی مرۆڤ دڵی پێیان دەکرێتەوە و لە دنیادا هاوچەشنیان دەچێژێت، لە بەهەشتدا دەیانبینێت و، بە چەشنێ کە شیاوی بەهەشت بێت چێژ و لەزەتیان لێ وەردەگرێت و، پاداشتی شوکرانە بێگەرد و پەرستنە تایبەتی‌یەکان، کە: چاو و گوێ و ئەندامەکانی تری لەشی مرۆڤ لەم دنیادا دەیانکات، لەودنیادا بەو لەزەتە جیسمانی‌یە تایبەتی‌یانە دەدرێتەوە.

کەواتە ڕوونکردنەوەی قورئانی پیرۆز سەبارەت بە چێژ و لەزەتە جیسمانی‌یەکان، ڕوونکردنەوەیەکی تەواو ڕوونە و، بە جۆرێکە هیچ تەئویلێك هەڵناگرێت کە لەو واتا ئاشکرایە دووری بخاتەوە، بەڵکو هەر بە هیچ جۆرێك دروست نی‌یە ئەو واتا ئاشکرایە وەرنەگیرێت و، لەو ڕاشکاوی‌یەی خۆی بترازێنرێت.

بەم جۆرە، بەروبووم و بەرهەمەکانی "ئیمان بە دواڕۆژ" ئەوەی دەرخست کە:

هەروەك ڕاستیی "گەدەی مرۆڤ" بەڵگەیەكی گومانبڕە لەسەر بوونی خۆراكەكان، بە هەمان جۆر "حەقیقەتی مرۆڤ" و كەماڵات و پێویستییە سروشتی و هیوا هەمیشەیی و ئامادەیی و لێهاتنەكانی، هەموویان، داخوازی ئەو بەرهەم و سوودانەی "باوەڕ بە ڕۆژی دوایی"ن و، بێ هیچ گومانێك دەبن بە بەڵگە لەسەر: دواڕۆژ و بەهەشت و چێژ و لەزەتی ماددی و هەست پێكراوی هەمیشەیی بەهەشت و، شایەتی لەسەر هاتنەدیی هەموو ئەوانە دەدەن.

هەروەها ڕاستیی كەماڵاتی ئەم گەردوونە و ئایەتە گەردوونییە پڕ لە داناییەكانی و هەموو ئەو ڕاستییانەش كە پەیوەندییان بە حەقیقەتەكانی مرۆڤەوە هەیە، هەموویان بەڵگەی بێ گومانن لەسەر بوون و هاتنەدیی دواڕۆژ و، شایەتیی ڕاست لەسەر هاتنی حەشر و كردنەوەی دەرگاكانی بەهەشت و دۆزەخ دەدەن.

جا لەبەر ئەوەی پەیامەكانی نوور بە شێوەیەكی جوان و بە چەندین بەڵگەی زۆر و بەهێز ئەم مەسەلەیان چەسپاندووە و هیچ لەكە و تۆزێكی گومانیان بە هیچ جۆرێك تێدا نەهێشتووەتەوە، بە تایبەتی "وتەی دەهەم" و "وتەی بیست و هەشتەم" بە هەردوو مەقامەكەیەوە و، "وتەی بیست و نۆهەم" و "تیشكی نۆهەم" و "پەیامی موناجات".. لەبەر ئەوە، لێرەدا ئەمەندەی لێ دواین.

* * *

ڕوونكردنەوەی قورئانی پیرۆز سەبارەت بە دۆزەخ ئەوەندە ڕوون و ئاشكرایە كە پێویست بە هیچ ڕوونكردنەوەیەكی تر ناكات. بەڵام لێرەدا بۆ لابردنی هەندێ گومان و لەكەی بێ بایەخ، زۆر بە كورتی دوو سەرنج باس

دەکەین. هەر کەسێکیش دەیەوێت بە درێژی لەم بارەیەوە ئاگادار بێت، با بگەڕێتەوە بۆ پەیامەکانی نوور.

❖ سەرنجی یەکەم:

ترسان و بیرکردنەوە لە دۆزەخ، هەرگیز چێژ و لەزەتی بەروبوومەکانی ئیمان لەناو نابات. چونکە میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە بانگ لەو کەسە دەکات کە لە دۆزەخ دەترسێت و، پێی دەڵێت:

(خێرا وەرە! ئەوە دەرگای تۆبەیە کراوەتەوە؛ لێیەوە وەرە ژوورەوە).

تەنانەت دۆزەخ تەنها بۆ ترساندن نییە، بەڵکو بۆ ئەوەشە کە تام و لەزەت و خۆشیی بەهەشتت بە باشی پێ بناسێنێت و بە تەواوی پێت بچێژێت و، بۆ ئەوەشە کە تۆڵەی تۆ و بوونەوەرانی تر لەوانەی دەستدرێژییان کردووەتە سەر مافی هەموان بسێنێتەوە و، هەموان بەم تۆڵەسەندنەوەیە دڵخۆش بن و دڵیان پێی بکرێتەوە.

ئەی ئەو کەسەی نوقمی گومڕاییە و ناشتوانێت لێی دەرباز ببێت!

بزانە کە بوونی دۆزەخ بۆ تۆ لە ئیعدام و لەناوچوونی هەتاهەتایی گەلێ باشترە! بەڵکو بوونی دۆزەخ بۆ کافرەکانیش هەر باشە و سەبارەت بەوان جۆرە میهرەبانییەکی تێدایە. چونکە مرۆڤ و ئەو ئاژەڵانەش کە سکوزایان هەیە، هەست بە خۆشحاڵیی کەسوکار و منداڵ و وەچە و خۆشەویستانیان دەکەن و، لە ڕوویەکەوە، بە بەختیاریی ئەوان بەختەوەر دەبن.

جا تۆیش - ئەی بێ بڕوای مولحید! - یان ئەوەیە بەهۆی ئینکاری کردنتەوە بۆ دۆزەخ بە چوونە ناو چاڵی "عەدەم" ڕازی ببیت، یان ئەوەیە دەچیتە دۆزەخەوە.

جا لەبەر ئەوەی "نەبوون"(العدم) ناتەواوییە و، هەر شەڕی ڕووتی لێ دەوەشێتەوە، ئەوا لەناوچوونی هەمیشەیی هەموو دۆست و خۆشەویستان و

خزم و کەس و نەوەکانت و ئەوانەی کە بە بەختیاری‌یان تۆ بەختەوەر دەبیت، دەبێتە ئاگرێکی سووتێنەر، دڵ و دەروونت هەڵدەقرچێنێت و ئازاری گیانی مرۆڤایەتیت دەدات و، گیانت بە ڕادەیەك دەخاتە ئەشکەنجەوە کە هەزار جاریش لە ئازاری دۆزەخ زۆرتر و بەسۆتر بێت. چونکە ئەگەر دۆزەخ نەبوایە بەهەشتیش نەدەبوو.

کەواتە بە کافربوونت هەموو شتێکت لە بەرچاودا دەکەوێتە هەڵدێری "نەبوون"ەوە. بەڵام ئەگەر تۆ بڕۆیتە دۆزەخەوە و لەناو چوارچێوەی "بوون"دا بمێنێتەوە، ئەوا کەسوکار و خۆشەویستانت یان لە ژیانی بەختەوەریی بەهەشتدان، یان لە چەند بازنە و چوارچێوەیەکی "بوون"دا و لە ژێر چاودێریی میهرەبانیی خوای گەورەدا دەژین.

کەواتە هیچ ڕێگایەکت بۆ ڕازی نەبوون بە دۆزەخ لە بەردەمدا نامێنێتەوە. چونکە ڕازی نەبوون بە بوونی دۆزەخ و گوێ پێنەدانی، بە تەواوی لایەنگرتنی "نەبوون" دەگرێتەوە، کە ئەویش بریتی‌یە لە قەلاچۆکردن و لەناوبردنی بەختەوەریی هەموو دۆست و خۆشەویستانت.

بەڵێ، دۆزەخ خانەیەکی وایە کە بە دانایی و دادگەری و میهرەبانیی خوای گەورە، لە چوارچێوەی "بوون"دا ڕۆڵی زیندان و بەندیخانە دەبینێت، ئەو "بوون"ەی کە خێروبێر و فەڕێکی ئاشکرا و ڕوونە. دۆزەخ چەندان جۆر فرمان و خزمەتگوزاریی تر و چەندین حیکمەتی سەر بە جیهانی مانەوەی ئەودنیای تێدایە و، جێگایەکی سامناکی زۆر زیندەوەری وەك "زەبانیە"یە.

❖ سەرنجی دووهەم:

بوون و ئازاری قورسی دۆزەخ ڕێ لە میهرەبانیی گەورە و دادگەریی ڕاستەقینە و دانایی ڕێکوپێکی خواوەند ناگرێت. بەڵکو میهرەبانی و

دادگەری و دانایی خوای گەورە داخوازی بوونی دۆزەخن و داوای بوونی دەکەن!

چونکە تۆڵەسەندنەوە لە ستەمکارێك کە خوێنی هەزاران بێ تاوانی مژیوە و دەستدرێژیی کردووەتە سەریان..

یان کوشتنی ئاژەڵێك کە سەدان ئاژەڵی داماوی لەناو بردووە..

ئەم تۆڵەسەندنەوەیەی کە بریتی‌یە لە هێنانەدیی ئەو دادگەری‌یەی خواوەند، لە ڕاستیدا میهرەبانی و بەزەیی هاتنەوەیە بە هەزاران ستەم لێکراوی بێ تاواندا..

بە پێچەوانەشەوە: چاوپۆشی لەو ستەمکارە و تۆڵە لێ نەسەندنەوە و گوێ پێ نەدانی، یان وازهێنان لەو ئاژەڵە و هێشتنەوەی لەسەر ئەو حاڵەی تیایدایە، لە ڕاستیدا ستەمێکی لەڕادەبەدەرە و زەوتکردنی بەزەیی و میهرەبانی‌یە لە هەزاران هەژار، بە بیانووی بەزەیی پێداهاتنەوەیەك کە هەرگیز لە جێی خۆیدا نی‌یە.

جا کافری موتڵەقیش، کە یەکێکە لەوانەی دەڕۆنە ناو بەندیخانەی دۆزەخەوە، بە بۆنەی کافربوونیەوە:

مافی ناوە جوانەکانی خوای گەورە ناسەلمێنێت. واتە: دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەو مافانە..

بە بۆنەی بەدرۆخستنەوەی شایەتیی هەموو بوونەوەران لەسەر ئەو ناوانەی خواوەند، ئەوا دیسانەوە مافی ئەو ناوانە ناسەلمێنێت و دەستدرێژی‌یان دەکاتەسەر..

هەروەها ئینکاری کردنی بۆ ئەو فەرمانبەری‌یە بەرزەی بوونەوەر، کە بریتی‌یە لە تەسبیحات کردنی لە بەرامبەر ئەو ناوانەی خواوەندەوە، بە دەستدرێژی‌یەکی تر لە قەڵەم دەدرێت..

هەروەها بەهۆی باوەڕ نەکردن و ئینکاریی ئەو مرۆڤە کافرەوە بۆ ئەو پەرستنە جۆراوجۆرەی کە بوونەوەران لە بەرامبەر دیاردە خوایی و پەروەردگارییەکانەوە پێشکەشی دەکەن، ئەو پەرستنانەی کە لە ڕاستیدا ئامانجی بەدیهێنانی بوونەوەرن و یەکێکن لە هۆکارەکانی دروستبوون و مانەوەی.. ئەم مرۆڤە، بەم کارەی دەستدرێژییەکی ئاشکرا دەکاتە سەر مافی هەموو بوونەوەران..

هەروەها بەهۆی بەدرۆخستنەوەی ئەو بوونەوەرانەی کە ڕۆڵی ئاوێنە دەبینن بۆ درەوشانەوەی ئەو ناوانە، دەستدرێژی دەکاتە سەر مافی هەموو ئەو بوونەوەرانە.

لەبەر ئەمانە.. "کافرێتی" تاوانێکی ئەوەندە گەورە و ستەمێکی هێندە لە ڕادەبەدەرە کە لە سنووری هەموو لێبوردن و چاوپۆشییەك دەرچووە، بۆیە زۆر بە ڕێکوپێکی شایانی هەڕەشەی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ﴾ (النساء:٤٨) بەڵکو ئەگەر بە بیانووی میهرەبانی و بەزەیی پێدا هاتنەوە، مرۆڤی وا نەخرێتە دۆزەخەوە، ئەوا ئەم کارە هەر بۆ خۆی کارێکی ناڕەوا و پێچەوانەی بەزەیی و میهرەبانییە و، پێشێل کردنی مافی ئەو ژمارە زۆرەی بوونەوەرانە کە مافیان خوراوە و ستەمیان لێ کراوە.

جا هەروەك ئەو خاوەن داوایانەی کە لە دنیادا مافیان خوراوە، داوای بوونی دۆزەخ دەکەن، عیززەتی شکۆمەندی و کەماڵی خوای گەورەش زیاتر خوازیاری بوونی دۆزەخن..

بەڵێ، ئەگەر کەسێکی سەرسەختی بێ پەروا بە کاربەدەستێکی خاوەن دەسەڵات بڵێت: (تۆ هەرگیز ناتوانیت بمخەیتە بەندیخانەوە).. چونکە ئەم قسەیە بە دەستدرێژی دادەنرێت بۆ سەر عیززەت و شکۆ و کەماڵی ئەو

فەرمانڕەوایە، ئەوا فەرمانڕەوای کاربەدەست ئەگەر لەوەوپێش بەندیخانەشی نەبووبێت، بە تایبەتی بۆ ئەم مرۆڤەی دروست دەکات و دەیخاتە ناویەوە!

کافری موتڵەقیش بە هەمان جۆرە؛ چونکە بە "کافربوون"ەکەی لە سنووری خۆی دەردەچێت و، دەستدرێژی دەکاتە سەر عیززەت و شکۆمەندیی خوای گەورە و، ڕووبەڕووی گەورەیی و دەستەڵاتی دەبێتەوە. ئەم هەڵوێستەشی بە ئینکاری و نەسەلماندنی کەماڵاتی خوایەتیی خوا دادەنرێت.

کەواتە ئەگەر هیچ کام لەو هۆکار و حیکمەتە جۆراوجۆر و کارمەندییە زۆرانەش نەبن کە داخوازی بوونی دۆزەخن، ئەوا بەدیهێنانی دۆزەخ بۆ ئەو جۆرە کەسانە یەکێك دەبێت لە خواستەکانی عیززەت و شکۆمەندیی خوای گەورە و، هەر لەبەر ئەوە دۆزەخیان بۆ دروست دەکات.

لە لایەکی تریشەوە "ماهییەتی کوفر" خۆی لەخۆیدا بوونی دۆزەخ دەگەیەنێت!

بەڵێ، هەروەك ئەگەر "ماهییەتی ئیمان" لە مرۆڤدا بەرجەستە و جێگیر ببێت، ئەوا بەهۆی جوانی و لەزەتەکەیەوە بەهەشتێکی تایبەتی بۆ خاوەنەکەی دروست دەکات و دەبێت بە نموونەیەکی بچووکی ئەو بەهەشتەی کە لەودنیادا چاوەڕێی دەکات.. بە هەمان جۆر "کوفر"یش بە تایبەتی "کوفری موتڵەق" هەروەها دووڕوویی(النفاق) و پاشگەزبوونەوە لە ئیمان(الردة) ئەوەندە تاریکی و ئێش و ئازاریان هەیە کە ئەگەر لە دەروونی خاوەنەکەیاندا جێی خۆیان بکەنەوە و تیایدا بەرجەستە ببن، ئەوا دۆزەخێکی ئەوتۆی بۆ پێکدەهێنن کە تابڵێیت ئازاری دەدات و دەبێت بە نموونەیەکی بچووکی ئەو دۆزەخەی لە دواڕۆژدا تێی دەچێت و ئازار و ئەشکەنجەکانی گەلێ لە هی دنیا سەخت و دژوارترە.

ئەمەشمان لە پەیامەکانی نووردا بە چەندین بەڵگەی گومان بڕ چەسپاندووە و، لە سەرەتای ئەم پەیامەشدا ئاماژەمان بۆ کردووە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم دنیا جێی چاندنی تۆوی ئەودنیایە و، هەرچی حەقیقەتی بچووکی ئەم دنیایەش هەن هەموویان لەودنیادا دەمیان دەپشکوێ و بەردەگرن و بەروبووم دەبەخشن، ئەوا ئەم تۆوە ژەهراوییەش (واتە: کوفر) لەم ڕوانگەیەوە ئاماژە بۆ "شجرة الزقوم"ی ئەودنیا دەکات و دەڵێت:

(من ڕەگ و تۆو و ئەسڵی ئەو درەختەم؛ هەر کەسێك لەم دنیا لە دڵی خۆیدا بمچێنێت، لەودنیا نموونەیەکی لەو درەختە بۆ دەهێنمەبەر و دەرخواردی دەدەم)!

مادەم "کوفر" بریتییە لە دەستدرێژی بۆ سەر چەندین مافی زۆر و سنوورشکاندنێکی ئاشکرا، ئەوا تاوانێکی لە ئەندازەبەدەرە و، هەر لەبەر ئەوەشە کە خاوەنەکەی شایانی ئەوەیە سزا و تۆڵەیەکی لەئەندازەبەدەر وەربگرێت.

ئەگەر تاوانی کوشتن، کە لە یەك خولەکدا ئەنجام دەدرێت، بە ئەندازەی پازدە ساڵ (نزیکەی هەشت ملیۆن خولەك) ئازار دەرخواردی قاتڵەکە بدات، کە ئەمەش بەپێی دادگەریی مرۆڤ و لەگەڵ بەرژەوەندی و مافی گشتیدا، کارێکی ڕێکوپێك و گونجاوە، ئەوا بێ هیچ گومانێك تەنها خولەکێکی کوفری موتڵەق - لەو ڕوانگەیەوە کە کوفر بەرامبەر بە کوشتنی هەزار مرۆڤ دەژمێررێت - هەر بەپێی دادگەریی مرۆڤ، دەبێ بە ئەندازەی هەشت ملیار خولەك سزا بدرێت! کەواتە ئەو کەسەی تەنیا ساڵێکی ژیانی بە کافری دەباتە سەر شایستەی ئازاری دوو تریلیۆن و هەشت سەد و هەشتا ملیار خولەکە، واتە شایستەی: ﴿خالِدين فيها أبدا﴾یە!

لە لایەکی تریشەوە شێوازە ڕێك و پەسەندەکەی قورئانی پیرۆز لـە بـارەی باسی بەهەشت و دۆزەخەوە و، ئەو بەڵگانـەی بەهەشـت و دۆزەخیـش کـە لـە پەیامـەکانی نـووردا – کـە تنۆکێکـی بەرەکـەتی قورئـانی پیرۆزن و تەفسـیری ئـەون – بـاس کـراون، ئـەوەندە ڕوون و ئاشـکران کـە بواریـان بـۆ هیـچ ڕوونکردنەوەیەکی تر نەهێشتووەتەوە.

بۆ نموونە:

﴿ويتفكّرونَ في خلقِ السّموات والأرض ربَّنا ما خَلقـــتَ هـــذا بـــاطلاً سُبحانكَ فقِنا عَذابَ النار﴾ (آل عمران: ١٩٠).

﴿ربَّنا اصرف عَنا عَذابَ جَهَنَّمَ إن عَذابَها كانَ غَراماً ۞ إنَّـــها سَـــاءت مُستَقراً ومُقاماً﴾ (الفرقان: ٦٥-٦٦).

هـەروەهـا ئـەو نـزا و پاڕانـەوانەی کـە پێغەمبـەری خۆشـەویسـتمان ﷺ و پێغەمبەرانی تـر – درووديـان لـەسـەر بێـت – و پیاوچاکـانی ئـەهلی حەقیقـەت هەمیشـە دووپاتیـان دەکـردەوە، وەك: "أجرنـا مـن النــار"، "نجنـا مـن النـار"، "خلصنـا مـن النـار" کـە لای ئـەوان بـەهۆی وەحیـەوە گەیشـتووەتە پلەیـەکی بەرزی وا گومان لەناو بيات..

هەموو ئەمانە، بۆمان دەردەخەن کە گرنگترین و گەورەترین کێشە لە ڕێی مرۆڤدا ڕزگاربوونە لە ئاگری دۆزەخ و، گەورەترین و سەرسووڕهێنەرترین و گرنگترین ڕاستیی ناو بوونەوەران بریتی‌یە لەو دۆزەخەی کـە بەشـێکی زۆری پیـاوانی خـوا لـە زانـا لێکۆڵـەرەکان و ئـەهلی کەشـف و شـهوود دەیبینـن و، بەشێکی تریان چاویان لە بڵێسەی ئاگر و چەرە دووکەڵەکەیەتی و، هەندێکی تریشیان گوێیان لە نرکە و گرمەی ئاگرەکەیـەتی و لـە تـاوا هـاوار دەکـەن و دەڵێن: أجرنا من النار!

بەڵێ، بەرامبەر وەستانی: خێر و شەڕ.. خۆشی و ئازار.. ڕووناکی و تاریکی.. گەرما و سەرما.. جوانی و ناشیرینی.. هیدایەت و گومڕایی و، تێهەڵکێش بوونیان لەگەڵ یەکتر لەم گەردوونەدا، تەنها لەبەر دانستێکی یەکجار گەورەیە. چونکە ئەگەر شەڕ نەبێت خێر نازانرێت و، ئەگەر ئازار نەبێت خۆشی و لەزەت ناناسرێن و، ئەگەر ڕووناکی تاریکیی لە بەرامبەرەوە نەبوایە جوانییەکەی دەرنەدەکەوت و، پلەکانی گەرمایش بەهۆی بوونی سەرماوە دێنەدی و، تەنها یەك ڕاستیی بچووکی "جوانی" بەهۆی بوونی ناشیرینییەوە دەبێت بە هەزار بەڵکو هەزاران ڕاستی. هەروەها ئەگەر دۆزەخیش نەبوایە زۆر لەزەت و خۆشیی بەهەشتیش نەدەما..

بەم پێیە دەتوانرێت - لە ڕوویەکەوە - هەموو شتێك بە دژەکەیدا بناسرێت و، "ڕاستی"یەك لەوانەیە بەهۆی دژەکەیەوە چەندین بەروبوومی "ڕاستی" بەرهەم بهێنێت.

مادەم ئەم بوونەوەرە جۆراوجۆر و تێکەڵە وەك لافاو دەڕوات و لە جیهانی فانی و نەمانەوە دەڕژێتە ناو جیهانی مان و نەفەوتانی ئەودنیا، ئەوا دەبێ: خێر و لەزەت و ڕووناکی و جوانی و ئیمان و هەرچی وەك ئەوان وایە، بڕژێنە بەهەشتەوە و.. شەڕ و ئازار و تاریکی و ناشیرینی و کوفر و هەموو شتێکی زیانبەخش بخرێنە ناو دۆزەخەوە. ئیتر بەم جۆرە، لافاوی بوونەوەر بە شەپۆلدانەوە بەرەو ئەو دوو گۆمە دەڕوات و لە ئەنجامدا لەوێ جێگیر دەبێت.

لێرەدا بەمەندە واز دەهێنین و، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو سەرنجە ڕەمزییانە دەکەین کە لە کۆتایی وتەی بیست و نۆهەمدان.

* * *

ئەی هاوەڵانی خوێندنم لەم قوتابخانە یووسفی‌یەدا!

تەنها یەك ڕێگای ئاسان هەیە بۆ ڕزگاربوون لە بەندیخانەی سامناکی هەمیشەیی (کە دۆزەخە). ئەویش لەوەدایە کە دەرفەت لە ماوەی مانەوەمان لەم بەندیخانە دنیاییەدا وەربگرین کە لە زۆر گوناهـ و خراپکاری دەستی گێڕاوینەتەوە و دووری خستووینەتەوە و دەربازی کردووین. کەواتە ئێمە تەنها ئەوەمان لەسەرە کە: بۆ کردەوە خراپەکانی پێشوومان داوای لێبوردن لە خوای گەورە بکەین و، فەرزەکان بەجێ‌بهێنین، تاکو هەموو سەعاتێکی ئەم بەندیخانەیەمان بخەینە حوکمی ڕۆژێکی خواپەرستی.

کەواتە ئەم بەندیخانەیە باشترین هەلە بۆ ڕزگاربوون لە بەندیخانەی هەمیشەیی و ڕۆشتنمان بۆ بەهەشتی نوورانی. خۆ ئەگەر ئەم هەلەمان لەدەست دەربچێت، ئەوا وەك دنیاکەمان نوقمی فرمێسك و خەفەت بووە، دواڕۆژیشمان هەر بەو چەشنە دەبێت و، ئەو فەرموودەیەی خواوەندمان تێدا دێتەدی کە دەفەرموێ: ﴿خَسِرَ الدُّنيا والآخرة﴾ (الحج:١١).

لەم کاتەدا کە ئەم باسە دەنووسرا دەنگی: "الله اکبر، الله اکبر، الله اکبر"ی جەژنی قوربانی پیرۆز دیوارەکانی بەندیخانەی دەبڕی و دەگەیشتە بەرگوێمان[1]. لەمەوە ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە:

پێنجیەکی گرۆی مرۆڤایەتی "الله اکبر" دەڵێنەوە و، سێ سەد ملیۆن موسڵمانیش بە یەکەوە دووپاتی دەکەنەوە. وەك بڵێی بە ئەندازەی گەورەیی و فراوانیی گۆی زەوی دەنگی "الله اکبر" بەرز دەبێتەوە و، زەوی ئەم وتە پیرۆزە بە گوێی هەسارە گەڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر و هەموو لایەکی تری ئاسماندا

---

(١) سُبحانَ مُقَدِّرِ الأمـــورا بێ ئەوەی هیچ ویست و مەبەستێکی زووتر لە ئارادا بووبێت، پاکنووسی کوردیی ئەم باسەش بەر جەژنی قوربانی سالی ١٤٠٩ی کۆچی کەوت کە دەکاتە پێنج شەممە ١٣/٧/١٩٨٩ز و، لە بارێکی دژواری وەك بەندیخانەیەکی مەعنەویدا دەژیام و، دڵنەوایی خۆم تەنها لە خزمەتی پەیامەکانی نووردا دەبینی‌یەوە! (وەرگێڕ)

دەدات. هەروەها زیاتر لە بیست هەزار حاجی لە عەرەفە و جەژندا زایەڵەی ئەو دەنگە دەڵێنەوە و دووپاتی دەکەنەوە کە هەزار و سێ‌سەد ساڵ پێش ئێستا پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی و ئالی بەیت و هاوەڵەکانیشی لەوەوە دەماودەم گێڕاویانەتەوە.

لەمەوە هەستێکی تەواو، بەڵکو قەناعەتێکی تەواوەتیم کرد کە ئەو هەموو دەنگ و دەنگدانەوە و دووپات کردنەوانە - لە ڕاستیدا - بریتین لە بەندایەتی‌یەکی فراوان و هەمەکی و گشتی و مەزنی ئەوتۆ کە لە بەرامبەر درەوشانەوەی پەروەردگاریێتیی خواوەندەوە - کە بە ئەندازەی مەزنیی خواوەندی (رب السموات والأرض) مەزنە - پێشکەش دەکرێت.

پاشان لە خۆمم پرسی: ئایا لایەنی پەیوەندی لە نێوان دوارۆژ و ئەم وشە پیرۆزەی "الله اکبر"دا چی‌یە؟ یەکسەر ئەوەم هاتەوە یاد کە ئەم وشەیە لەگەڵ وشە پاك و چاك و هەمیشەییەکانی تردا، واتە: (سبحان الله، الحمد لله، لا إله إلا الله) و هاوچەشنیان لەو وشانەی کە دروشمی ئیسلامن، بێ هیچ گومانێك، چ بە چەشنێکی هەمەکی و چ بە چەشنێکی هەندەکی، دوارۆژ دەخەنەوە یادی مرۆڤ و ئاماژە بۆ هاتنەدیی ڕۆژی دوایی دەکەن:

★ ڕووی یەکێك لە واتاکانی "الله اکبر" ئەوەیە کە: توانست و زانستی خوا لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە و، لە هەموو شتێك گەورە و مەزنترە و، هیچ شتێك لە بازنەی زانست و لە ژێر توانستی ئەو دەرناچێت، خواوەند لە هەموو شتێك، کە بە گەورەی دەزانین و لێی دەترسین، گەورەترە. واتە: خوا‌وەند لە بەدیهێنانی حەشر کە بە کارێکی گەورەی دەزانین گەورەترە.. لەوەش کە ئێمە لە "نەبوون" ڕزگار بکات و بەختەوەریی هەمیشەییمان پێ ببەخشێت - کە ئێمە بە کارێکی مەزن و گەورەی تێدەگەین - مەزن و گەورەترە.. لە هەموو ئەو شتانەی لە دەرەوەی بازنەی ژیرمانن و مایەی سەرسووڕمانی ئێمەن، گەورەترە.. چونکە دەفەرموێ:

﴿ما خَلقُكم ولا بعثُكم إلاّ كَنفسٍ واحدة﴾ (لقمان:٢٨).

ڕاشکاویی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە توانستی خوای گەورەدا، حەشر و نەشری سەرجەمی گرۆی مرۆڤایەتی بە ئەندازەی بەدیهێنانی یەك تاکە کەس ئاسانە!

کەواتە بەلاتەوە سەیر نەبێت کاتێ کە مرۆڤ شتێکی گەورە یاخود ئامانجێکی مەزن دەبینێت یان دووچاری گرفتێکی گەورە دەبێت، "الله اکبر" دەکات و، بەمەش دڵی خۆی دەداتەوە و، هێزێکی گەورە لەم وشە پیرۆزەدا دەبینێت و پاڵی پێوە دەداتەوە.

بەڵێ، وەك لە "وتەی نۆهەم"دا باس کراوە، ئەم وشەیە و وشەکانی تری وەك ئەم، واتە: "سبحان الله و الحمد لله" بریتین لە پێرستی هەموو پەرستشەکان و "تۆو" و پوختەی نوێژ. جا دووپات بوونەوەی ئەم وشانە، کە لە ڕاستیدا سێ ڕاستیی گەورەی نوێژ و زیکرەکانی نوێژن، تەنها بۆ بەهێزکردن و جێگیرکردن و دامەزراندنی ناوەرۆکی نوێژە.

هەروەها ئەم وشانە وەڵامێکی گومانبڕن بۆ ئەو پرسیارانەی کە لەو سەرسوورمان و چێژ و سام و هەیبەتەی مرۆڤەوە پەیدا دەبن کاتێ سەیری گەردوون دەکات و، ئەو شتانەی تێدا دەبینێت کە دەیوروژێنن و، دەیخەنە سەرسوورمان و شوکرانەبژێرییەوە و، سەرسوورهێن و جوان و مەزن و زۆر و لە عادەت بەدەرن و، خولگەی مەزنی و گەورەیی پەروەردگارن.

بەڵێ، لە ڕۆژی جەژندا "سەرباز" وەکو "فەرماندەی گشتی" دەرواتە حوزووری "پادشا". بەڵام لە ڕۆژانی تردا شتی وای بۆ نارەخسێت، بەڵکو لە ڕێی ڕوتبە و پلەی ئەفسەرەکەیەوە پادشا دەناسێت..

بە هەمان جۆر لە "حەج"یشدا هەموو کەسێك خواوەندی خۆی بە ناوی: "پەروەردگاری زەوی و جیهانەکان" و بە ناسینێکی وەك خواناسیی ئەولیا و پیاوچاکان دەناسێت. ئیتر هەتا پلەکانی گەورەیی و مەزنیی خواوەند لەناو

دڵیدا بکرێنەوە، پتر بە "الله اکبر" وەڵامی ئەو پرسیارە دووپاتبووە زۆر و سەرسووڕهێنەرانە دەداتەوە کە بەسەر گیانیدا زاڵ بوون. کەواتە "الله اکبر" وەڵامێکی وایە هەموو فرتوفێڵێکی شەیتان ڕیشەکەن دەکات، وەك لە "بریسکەی سیازدەهەم"دا باس کراوە.

* هەروەك وشەی "الله اکبر" وەڵامێکی کورت و بەهێزی ئەو پرسیارەی ئێمەی دایەوە کە سەبارەت بە دوارۆژەوە کردمان، وشەی "الحمد لله"یش بەهەمان جۆر دوارۆژمان یاددەخاتەوە و داخوازی دەبێت.

چونکە ئەم وشەیە پێمان دەڵێت: واتاکانم بە بێ هاتنەدیی قیامەت تەواو نابن. چونکە واتاکەم ئەوە دەگەیەنێت کە:

(هەر سەنا و ستایش و سوپاسێك لە ئەزەلەوە تا ئەبەد لە هەر سوپاسگوزارێکەوە بۆ هەر سوپاسکراوێك پێشکەش کرابێت، تەنها تایبەتە بە خواوەندەوە).

جا لەبەر ئەوەی کە "بەختەوەریی هەمیشەیی" بناغە و لوتکەی هەموو نیعمەتێکە و، تەنها ئەو - لە ڕاستیدا - نیعمەتەکان دەکات بە نیعمەتی ڕاستەقینەی هەمیشەیی و، هەر ئەویشە کە هەموو خاوەن هەست و نەستێك لە موسیبەتی "نەبوون" ڕزگار دەکات، ئەوا هەر تەنها ئەو "بەختەوەریی هەمیشەیی"یە دەتوانێت پڕاوپڕ و بەرامبەری واتا گشتییەکەم بێت.

بەڵێ، کاتێ کە ئیماندار هەموو ڕۆژێك بە پێی فەرمانی شەرع لە دوای نوێژەکانی بە لای کەمەوە سەد و پەنجا جار (الحمد لله) دەڵێتەوە، کە ئەمەش ستایش و سوپاسگوزارییەکی زۆر فراوان و دوور و درێژی لە ئەزەلەوە تا ئەبەد دەگەیەنێت، ئەم کارە لە ڕاستیدا، بەهایەکی پێشەکییە بۆ دەستکەوتنی بەختەوەریی هەمیشەیی بەهەشت کە ئەو ئیماندارە پێشکەشی دەکات..

چونکە ناکرێت و ناگونجێ واتای ئەم شوکرانەبژێرییە تەنها بۆ نیعمەتە کەمخایەن و کورت و ئاوێتەی ئازارەکانی دنیا بێت، تەنانەت ئەگەر سەرنج

لەو نیعمەتانە بدەین، دەبینین هەر خۆیان لە خۆیاندا تەنها چەند هۆکارێکن بۆ دەستخستنی چەندین نیعمەتی هەمیشەیی کە شایانی ئەوەن شوکرانەیان لەسەر پێشکەش بکرێت.

★ وشەی "سبحان الله"یش، پاك و پیرۆز ڕاگرتنی خواوەند دەگەیەنێت لە هەموو هاوبەش و، کەموکووڕی و، ستەم و، کۆڵەواری و، توندوتیژی و، پێویستی و، فرۆفێڵ و، هەموو شتێکی تری وا کە لەگەڵ کەماڵ و جوانیی گەورەیی ئەودا نەگونجێت.

جا ئەم واتا و ناوەرۆکە "بەختەوەریی هەمیشەیی"مان دەخاتەوە یاد و دەبێتە بەڵگەیەك لەسەر دوارۆژ کە تەوەرەی مەزنی و شکۆمەندی و جوانیی خواوەندە. هەروەها ئاماژەش بۆ بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتی ئەودنیا دەکات و بەڵگەیە لەسەری.

دەنا گەر بەختەوەرییەکی هەمیشەیی نەبێ و نەیەتە کایەوە، ئەوا پەنجەی تۆمەتبارکردن ئاراستەی مەزنی و کەماڵ و جوانی و شکۆمەندی و میهرەبانیی ئەو خواوەندە دەکرێت و کەموکووڕییان تێکەڵ دەبێت، خۆ دیارە خواوەند زۆر زۆر پیرۆز و خاوێن و بەرزە بەسەر ئەو جۆرە شتانەدا.

واتە: هیچ گومانێك لە هاتنی دوارۆژدا نییە. چونکە مەزنی و کەماڵ و جوانی و شکۆمەندی و میهرەبانیی خواوەند، داخوازی ئەو دوارۆژەن.

بەم جۆرە، هەریەکە لەم سێ وشە پیرۆزە، لەگەڵ "بسم الله" و، "لا إله إلا الله" و، وشە پیرۆزەکانی تردا، چەند تۆوێکن لە تۆوەکانی بنچینەکانی ئیمان و، هەریەکەیان پوختەیەکی ڕاستییەکانی پایەکانی ئیمان و، حەقیقەتەکانی قورئانن.

جا هەروەك ئەم سێ وشانە تۆوی نوێژن، تۆوی قورئان و هەندێ سوورەتیشن. چونکە سەرەتای هەندێ سوورەت بەمانە دەست پێ دەکات.

وەك بلێیت ئەو پێشەکی‌یە گەوهەرێکی پرشنگدارە و لە سەرەتای ئەو سوورەتەدا دانراوە. هەر ئەم وشانە بریتین لە چەند گەنجینەیەکی ڕاستەقینە و چەندین بناغەی پتەوی چەند بەشێکی پەیامەکانی نوور کە بە (سەوانیحی تەسبیحات)[1] دەست پێ دەکەن.

هەروەها ئەم وشانە ویردەکانی تەریقەتی محەممەدین ﷺ کە لە دوای نوێژەکان و لە نێوان بازنەیەکی زیکری یەکجار فراوانی ویلایەتی ئەحمەدی و بەندایەتیی محەممەدیدا دەخوێنرێن، بە چەشنێ کە لەگەڵ هەموو نوێژێکدا زیاتر لە (سەدان ملیۆن) ئیماندار لەو بازنەی زیکرە گەورەیەدا بە یەکەوە سی و سێ جار (سبحان الله) و، سی و سێ جار (الحمد لله) و، سی و سێ جار "الله اکبر" دەڵێنەوە.

بێ گومان ئێستا هەست بە ڕادەی گرنگیی خوێندنی ئەو سێ وشە پیرۆزە دەکەیت کە پوختە و تۆوی قورئان و ئیمان و نوێژن و، ڕادەی پاداشتیان دەزانیت کە هەریەکەیان سی و سێ جار لە دوای نوێژ و لەو بازنە فراوانەدا دووپات بینەوە.

جا هەروەك مەسەلەی یەکەمی ئەم پەیامە دەرسێکی بەنرخ بوو لە بارەی نوێژەوە، وا کۆتاییەکەشی - بە بێ هیچ ویستێکی خۆم - دەرسێکی گرنگ دەرچوو لە بارەی زیکرەکانی نوێژەوە! کەواتە سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر بەخششەکانی.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

* * *

---

(١) ئەو پەیامانە بە ئایەتی: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ دەست پێدەکەن. (وەرگێڕ)

## مەسەلەی نۆهەم:

**"ئیمان" بەش بەش ناکرێت**

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ﴾ (البقرة:٢٨٥)

ئەو شتەی بوو بەهۆی ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتە گەورە و بەرز و پیرۆزە، حاڵەتێکی تایبەتی بوو، کە لە ئەنجامی پرسیارێکی مەعنەوی و سەرسووڕهێنەر و، دەرکەوتنی نیعمەتێکی گەورەی خواوەندەوە سەری هەڵدابوو. ئەویش بەم جۆرە بوو:

**ئەم پرسیارە ڕووی لە گیانم کرد:**

بۆچی ئەو کەسەی ئینکاریی بەشێکی ڕاستییەکی ئیمان بکات "کافر" دەبێت و، ئەو کەسەش قبووڵی نەکات بە موسڵمان دانانرێت، لە کاتێکدا کە نووری (ئیمان بە خوا و ڕۆژی دوایی) وەك ڕۆژی ڕووناك وایە؛ هەموو تاریکییەك دەڕەوێنێتەوە؟

پاشان بۆچی ئەو کەسەی ئینکاریی ڕاستییەك یان پایەیەکی ئیمان دەکات بە "مورتەد" دادەنرێت و بەرەو هەڵدێری کوفری موتڵەق بەری دەداتەوە و، ئەو کەسەش کە ئەو ڕاستییە یاخود ئەو پایەی ئیمانە قبووڵ ناکات لە بازنەی ئیسلام دەردەچێت، کە دەبوو لە هەمان کاتدا باوەڕبوونی

جا لەبەر هەموو ئەم دانستانەیە کە قورئانی پیرۆز بەوپەڕی دانایییەوە ئەو شتانە دووپات دەکاتەوە، بەمەش دەری دەخات ئەو هەڕەشە زۆر و زەبەندانەی کە تا ئەم ئەندازەیە و بەم هێز و توندوتیژی و دووپاتبوونەوەیەن کە باسمان کردن، ڕاستییەکی گەلێ گەورەیە و، شەیتانیش هەڵدێت لەوەی کە بە ناڕەوا و گاڵتەی بزانێت. بەڵێ، سزای دۆزەخ بۆ ئەو کافرانەی گوێ بۆ هەڕەشەکان ڕاناگرن، کارێکە یەکپارچە دادگەرییە.

❐ یەکێکی تر لەو شتانەی کە قورئان دووپاتیان دەکاتەوە، چیرۆکی پێغەمبەرانە، درووودیان لەسەر بێت.

بۆ نموونە:

دانایی لە دووپاتبوونەوەی چیرۆکی حەزرەتی مووسادا - درووودی خوای لەسەر بێت - (کە بە ئەندازەی عەسای مووسا دانست و سوودی تێدایە) و، حیمکەتی دووپاتبوونەوەی چیرۆکی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بریتییە لە چەسپاندنی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرمان ﷺ، ئەمەش بە دەرخستنی ئەوەی کە پێغەمبەرێتیی هەموو پێغەمبەران بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "ڕیسالەتی ئەحمەدی" ڕاستە و، لە هەموویان حەقتر و شایانترە بۆ شوێنکەوتن. چونکە مەگەر یەکێك ئینکاریی پێغەمبەرێتیی هەموو پێغەمبەران بکات، دەنا مومکین نییە ئینکاریی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەمەد ﷺ بکات. کەواتە باسکردنی چیرۆك و بەسەرهاتی ئەوان، بەڵگەی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەمەدن ﷺ.

پاشان بەشێکی زۆری خەڵك ناتوانن و، هەموو کاتێك بۆیان ناڕەخسێت کە قورئانی پیرۆز بخوێننەوە، بەڵکو چەندەیان بۆ لوا بەوەندە وازدەهێنن. ئا لێرەدا حیکمەتی ئەوە بە جوانی دەردەکەوێت کە هەموو سوورەتێکی درێژ و مامناوەندی لە بریی قورئانێکی بچووککراوەن..

ئنجا دووپاتکردنەوەی چیرۆکەکانیش وەك دووپاتبوونەوەی پایەکانی ئیمان وایە، کە پێویستیان بە دووپاتبوونەوە هەیە. واتە: ڕەوانبێژی داخوازی دووپاتبوونەوەی ئەم چیرۆکانەیە و، هیچ زیادەڕەوی‌یەك لەم کارەدا نی‌یە. لەمەش زیاتر، ئەم دووپاتبوونەوەیە تێماندەگەیەنێت کە ڕوودانی پەیدابوون و سەرهەڵدانی حەزرەتی محەممەد ﷺ گەورەترین ڕووداوی مرۆڤایەتی و شکۆمەندترین مەسەلەی نێوان مەسەلەکانی گەردوونە.

بەڵێ، کە زاتی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ مەزنترین و بەرزترین پلەی لە قورئاندا دراوەتێ و (محمد رسول الله)یش، کە چوار پایەی لە پایەکانی ئیمان تێدایە، لەگەڵ (لا إله إلا الله)دا بەیەکەوە دەوترێن، بەڵگەیەکی گەلێ گەورە و بێ وێنەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەریی حەزرەتی محەممەد ﷺ گەورەترین ڕاستیی ناو گەردوونە و، بەڕێزترینی هەموو بەدیهێنراوانە بە گشتی و، "حەقیقەتی محەممەدی"ش - کە بریتی‌یە لە کەسێتی‌یە مەعنەوی و هەمەکی‌یەکەی ئەو ﷺ - چرای ڕووناکی‌بەخشی هەردوو جیهانەکەیە و، ئەم پێغەمبەرەش شایان و شیاوی ئەم پلەوپایە دەراسایەیە، وەك بە چەندین بەڵگەی جۆراوجۆر لە بەشەکانی پەیامەکانی نووردا چەسپێنراوە.

وا لێرەشدا و لە نێوان هەزار بەڵگەدا، یەك بەڵگە دەهێنین و بەم جۆرەی خوارەوە باسی دەکەین:

بەپێی دەستووری: "السبب كالفاعل" بە ئەندازەی هەرچی کردەوەی چاکی نەتەوەکەی حەزرەتی محەممەد هەیە ﷺ لە هەموو کات و سەردەمێکدا لە لاپەڕەی چاکەکاری‌یەکانی پێغەمبەردا ﷺ کردەوەی چاکە دەنووسرێت.

ئنجا ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەو نوورەی کە هێناویەتی، ڕاستی‌یەکانی بوونەوەران ڕووناك دەکاتەوە. بەم کارەشی نەك تەنها جینی و ئینس و مەلائیکەت و زیندەوەران دەخاتە سوپاسگوزاری و ڕەزامەندی‌یەوە، بەڵکو

هەر هەموو گەردوون و ئاسمان و زەوی بە گشتی ڕەزامەندیی خۆیان لە بەرامبەریەوە دەردەبڕن و، دەماودەم بە هەموو جۆرێك ڕەوشت بەرزی‌یەکانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەگێڕنەوە و باسی دەکەن.

ئنجا بە نیشانەی ئەوەی کە دوعای ڕووەکەکان بە زمانی ئامادەیی و قابیلییەتیان و، هی زیندەوەران کە بە زمانی سروشت دەیکەن، بە چاو دەیبینین کە هەرهەموویان گیرا دەبن.. بەمەدا دەردەکەوێت کە ملیۆنەها نزای گیرا و سروشتیی ملیۆنەها پیاوچاکی نەتەوەکەی ئەو پێغەمبەرەش ﷺ لەگەڵ ڕۆحانی‌یەکاندا، بە هەمان جۆر، گیرا دەبن.

جا ئەم دوعا و نزایانەی کە ئەولیا و پیاوچاکان بەردەوام هەرچی ڕۆژە دەیانکەن و، دوعای ڕەحمەت بۆ ناردنی بە صەلات و سەلام لێکردنی دەینێرن و، دەستکەوتە مەعنەوی و کردەوە چاکەکانیان، هەموو ئەوانە، لە پێشدا پێشکەش بەو پێغەمبەرە ﷺ دەکرێن. سەرەڕای ئەو نوورە زۆر و لە سنووربەدەرەی کە لە قورئان خوێندنەوەی نەتەوەکەیەوە دەچێتە ناو دەفتەری کردەوە چاکەکانیەوە. ئەو قورئانە پیرۆزەی کە هەر پیتێك لە سێ سەد هەزار پیتەکەی (دە) پاداشت هەتا دەگاتە (سەد) بەڵکو تا (هەزار) چاکە و بەروبوومی دوارۆژ بە خوێنەرەکەی دەبەخشێت.

بەڵێ، خواوەندی زانای پەنهان، زووتر دەیزانی و دەیبینی: "حەقیقەتی محەممەدی" - کە کەسێتیی مەعنەویی ئەو زاتە پیرۆزەیە ﷺ - وەکو نموونەی درەختی "تووبا"ی بەهەشت وایە. لەبەر ئەوە، لە قورئانەکەی خۆیدا ئەو گرنگی‌یە مەزنەی پێ داوە، چونکە هەر ئەوە لە هەموو کەسێك شایانتری ئەو پلەوپایە بەرزە بێت.

ئەو خواوەندە لە فەرمانەکانیدا ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە دەستکەوتنی شەفاعەتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ تەنها بە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی و

شوێن پێ هەڵگرتنی سوننەتی پیرۆزی ئەو دەبێت و، هەر ئـەوە کـە گـەورەترین مەسەلەکانی نێوان مـرۆڤ بێـت. بـەڵکو قورئـانی پـیرۆز جارجـار بایـەخی بـە لایەنە مرۆڤانەکەشی داوە، کە وەك تۆوی درەختی "تووبا"ی بەهەشت وایە.

جا لـەبەر ئەوەی کە ڕاستی‌یە دووپاتبووەکانی قورئان ئەم نرخە بەرزانـەیان هەیە و، ئەو هەموو دانستەیان تێدایە کە باس کران، ئەوا سروشتی سـاغ و بێ عـەیب و تـەواوی مـرۆڤ شـایەتی لـەسـەر ئـەوە دەدات کـە دووپاتبوونـەوە لـە قورئـاندا، موعجیزەیـەکی بـەهێز و فراوانـە. مەگـەر یـەکێك بـە تـاعوونی ماددییـەت دڵ و ویژدانـی نـەخۆش کـەوتبێت. ئـەو جـۆرە کەسـانەش ئـەم دەستووورە بەناوبانگە دەیانگرێتەوە کە دەڵێت :

قد تنكِرُ العينُ ضوءَ الشمس من رمدٍ     وينكرُ الفم طعمَ الماءِ من ســقَمِ[1]

* * *

## کۆتایی

### ئەم مەسەلەی دەهەمە لە دوو پەراوێزدا

○ پەراوێزی یەکەم:

دوازدە سـاڵ پێش ئێسـتا بـەر گوێم کـەوت کـە: زەندیقێکـی سەرسـەخت دەروونی خراپ و مەبەستی پیسی خۆی ئاشکرا کردووە بـەوەی کـە قورئـانی پیرۆزی وەرگێڕاوە. بەم هەوڵدانی وەرگێڕانەی قورئانیش پلانێکـی ترسناکی

(١) واتە بەهۆی "چاوئێشە"وە هەندێ جـار چـاو ئینکـاریی ڕووناکیی خۆر دەکات و، بەهۆی "نەخۆشی"یەوە دەمی مـرۆڤ ئینکـاریی تـامی ئـاو دەکات. ئەم شیعرە هـی ئیمـامی بوصیری‌یە. بڕوانە: "بردة المديح" الفصل السادس. (وەرگێڕ)

بۆ ڕێزنەهێشتنی قورئان ساز کردووە و، وتوویەتی: با قورئان وەربگێڕرێت تاکو نرخەکەی دەربکەوێت..

بە خەیاڵی خۆی گوایا: با خەڵکی دووپاتبوونەوە ناپێویستەکانی ببینن و، لە بریی خۆی وەرگێڕراوەکەی بخوێننەوە... هتد لەم بیروڕا ژەهراوییانە.

بەڵام بە فەزڵی خوای گەورە "پەیامەکانی نوور" بەهۆی بەڵگە بەهێزە بیانووبڕەکانی و، بڵاوبوونەوەی بە جۆرێکی فراوان لە هەموو شوێنێکدا، ئەو بیر و پلانەی ئەوی لەباربرد و پەکی خست و، بە چەشنێکی گومانبڕ چەسپاندوویەتی کە:

هەرگیز لە توانادا نییە بە جۆرێکی ڕاستەقینە قورئانی پیرۆز وەربگێڕرێت و، هەر زمانێکی تری جگە لە زمانی عەرەبیی فوصحا هەرگیز ناتوانێت تایبەتکاری و سەرنجە ورد و ناسکە ڕەوانبێژییەکانی قورئان بپارێزێت و، ئەو وەرگێڕراوە سادە و جوزئییانەی کە مرۆڤ دەیانکەن، بە هیچ حاڵێك جێی تەعبیرە پڕ و تۆکمە و ئیعجازبەخشەکانی قورئان ناگرنەوە، کە لە هەر پیتێکیدا لە "دە"وە تا "هەزار" چاکەی تێدایە. لەبەر ئەوە، هەرگیز مومکین نییە لە بریی خۆی وەرگێڕراوەکەی بخوێنرێتەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەمە، ئەو موونافیقانەی کە قوتابیێتیی ئەو زەندیقەیان کردبوو، لە پێناوی شەیتاندا چەند هەوڵێکی هەڵەشانەیان دا، تاکو بە دەموپلی خۆیان نووری قورئانی پیرۆز بکوژێننەوە..

جا لەبەر ئەوەی من کەس نابینم و تێکەڵی خەڵکی ناکەم، ئەوا ڕاستیی ئەو شتانەی لە بارودۆخی دەرەوەدان نازانم و لە بارەیانەوە ئاگادار نیم. بەڵام زیاتر وا گومان دەبەم کە ئەمەی ئێستا باسم کرد بوو بەهۆی نووسینی مەسەلەی دەهەم، هەرچەندەش لە هەموو لایەکەوە تەنگانە دەورەی دابووم.

○ پەراوێزی دووهەم:

ڕۆژێکیان، دوای بەربوونمان لە بەندیخانەی "دەنیزلی" لە نهۆمی سەرەوەی ئوتێلی "شەهر"دا دانیشتبووم و سەرنجی ئەو دار چنارە زۆرانەم دەدا کە لەناو باخچە و بێستانە دڵڕفێنەکانی دەوروبەرمدا بوون. بینیم ئەو درەختانە بەو جموجووڵ و لەنجە و لارەی کە لە بنکەوە هەتا لق و پەلەکانیان دەیاننواند، دڵخۆش دیارن و هەر کە بە ئاستەم سروەیەکیان بەردەکەوێت، یەکسەر گەڵاکانیان دەلەرێنەوە. بەم جۆرە ئەو درەختانەم لە جوانترین و شیرینترین شێوەدا هاتە پێش چاو، وەك ئەوەی لە ئەڵقەی زیکر و تەهلیلەدا خەریکی تەسبیحاتی خواوەند بن.

ئەم جموجووڵە ناسکانە، دەستکاریی ژێیەکانی دڵیان کردم، لەو کاتەدا کە دڵم لە پەژارەی جودایی خۆشەویستانمدا بوو، هەروەك خۆیشم لە خەمی ئەوەدا بووم کە بە تەنها مابوومەوە..

کتوپڕ دوو وەرزەکەی پایز و زستانم بە دڵدا هات و، بێ ئاگایی سەری تێکردم، چونکە لەو دوو وەرزەدا گەڵاکان هەڵدەوەرێن و جوانییان نامێنێت.. لەمەوە خەم و خەفەتی زۆرم خوارد بۆ ئەو دار چنارە جوانانە و هەموو زیندەوەران، کە ئێستا ئەو خۆشی و شادییەیان پێوە دەبینرێت، کەچی لەو دوو وەرزەدا گەڵاکانیان ئاوا هەڵدەوەرێت!

بەڵێ، گەلێ خەفەت و ئازارم چەشت و، هێندە پەژارەی ئەوتۆشم لەسەر کۆبوونەوە (کە لە نەمان و جوداییەوە پەیدا بوون و ئەم پەردە ڕازێنراوە جوانەی بوونەوەریان پڕکردووە) کە بە جارێ هەردوو چاوم نوقمی فرمێسك بوون.

لەم کاتەدا کە من لەم بارە پەرێشان و خەم و پەژارەیەدا بووم، لە پڕ نووری حەقیقەتی محەممەدی ﷺ هەروەك بە هانای هەموو ئیمانداریکەوە دێت، بە هانای منیشەوە هات و، یەکسەر ئەو خەم و خەفەتە لە سنوور بەدەرانەی

نەهێشت و هەموویانی گۆڕی بە چەندین شادمانی و دڵخۆشیی لەڕادەبەدەر. ئیتر بە هەمیشە و بەردەوامی کەوتمە ڕەزامەندی و سوپاسگوزاریی ئەو حەقیقەتی محەممەدی‌یەی کە تەنها یەك بەش لە بەشە زۆرەکانی لێشاوی نووره لە سنووربەدەرەکەی، منی ڕزگار کرد و، لە هەموو سووچێکی دەروون و ناخی ویژدانمدا دڵنەوایی بڵاوکردەوە. ئەوەش بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

ئەو ڕوانینە بێ ئاگایانەیە، گەڵا ناسك و درەختە باڵابەرزەکانی بە بێ ئەرك و فەرمانبەری و بە بێ سوود و بایەخ پیشاندام و، وای لە ئەندێشەم گەیاند کە لەرینەوە ناسك و جوانەکانیان هی توندی و زۆریی شەوق و شادی و خۆشیی ئەوان نی‌یە، بەڵکو هی بیم و ترس و لەرزە لەتاو سامناکیی نەمان و جودایی و لەناوچوون!

بەڵێ، ئەو ڕوانینە بێ ئاگایانەیە وای پیشاندام، ئەولاتر بچێت..

بەم پیشاندانەش عیشقی مانەوە و، خۆشەویستیی ژیان و، شەیدا بوون بۆ جوانی و، بەزەیی هاتنەوەش بە هاوڕەگەزدا، کە لە من و هەموو کەسێکی تردا ڕەگیان داکوتاوە، هەموو ئەمانەمی پێکا و، دنیای لێ کردم بە دۆزەخێکی مەعنەوی و، عەقڵیشی بۆ گۆڕیم بە ئەندامێك بۆ دەردیسەری و چەشتنی ئازار..

ئا لەم کاتەدا کە من لەم بارودۆخە پڕ لە ئازارەدا بووم، لە پڕ دەبینم ئەو نوورەی کە حەزرەتی محەممەد ﷺ هەموو مرۆڤایەتیی پێ ڕووناك کردەوە، پەردە لەسەر چاوەکانم لادەبات و، چەندین دانست و واتا و ئەرك و فەرمانبەریی یەکجار زۆر، کە دەگەنە ژمارەی گەڵای چنارەکان، لە پێش چاومدا دەردەخات. "پەیامەکانی نوور" چەسپاندوویانە کە ئەو فەرمانبەری و ئەرکانە سێ بەشن[1]:

---

(١) مامۆستا نوورسی لێرەدا دوو فەرمانبەریی باس کردووە. چونکە سێ‌هەمیان هی شتەکە خۆیەتی. بڕوانە: (وتەی دەهەم، ڕاستیی شەشەم). (وەرگێڕ)

❖ *بەشی یەکەم:*

ئەو بەشەیە کە دەڕوانێتە ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری مەزن. جا هەروەك ئەگەر وەستایەکی کارامە و لێهاتوو مەکینەیەکی بێ وێنە دابهێنێت، ئەوا هەموان ستایشی دەکەن و ڕێز لە کارەکەی دەنێن و پیرۆزبایی داهێنانەکەی لێ دەکەن، مەکینەکەش بە هەمان جۆر لە ئاستی خۆیدا پیرۆزبایی لە داهێنەرەکەی دەکات و بە زمانی حاڵ ستایشی دەکات، بەوەدا کە ئەو بەرهەمانەی ئەوی لە پێناودا دروست کراون و ئامانجی بەدیهێنەرەکەین و ئێستا خۆی بەرهەمی هێناون، بە جۆرێکی تەواو پیشانی کەسانی تر دەدات.

❖ *بەشی دووهەم:*

ئەوەیە کە ڕوو دەکاتە ڕوانین و بەرچاوی زیندەوەران و بەدیهێنراوە خاوەن هەست و شعوورەکان. واتە: دەبێتە مایەی موتالا و سەیرکردنێکی شیرین و سەرنجدانێکی بەتام بۆ خاوەن هەستان. ئیتر هەموو شتێك وەکو کتێبێکی زانستیی لێ دێت و، ئەم جیهانە بینراوە بەجێ ناهێڵێت هەتا واتاکانی خۆی لە زەینی خاوەن هەست و شعوورەکاندا و، چاپکردنی وێنەکانی لە مێشکیاندا و، ڕەنگدانەوەی وێنەکەی و چاپبوونی لە لەوحی میسالیی تۆمارەکانی جیهانی پەنهانی غەیبدا، بەجێ نەهێڵێت. واتە لە جیهانی بینراوەوە بۆ جیهانی پەنهان ناگەڕێتەوە تاکو نەچێتە ناو چەندین بازنەی "بوون"ی زۆرەوە و، چەندین جۆری "بوون"ی مەعنەوی و غەیبی و زانستی بەدەست نەهێنێت.

بەڵێ، مادەم خوا هەیە و زانستی ئەو هەموو شتێکی گرتووەتەوە، ئەوا لە ڕوانگەی حەقیقەتەوە نابێ بە هیچ جۆرێك لە جیهانی ئیمانداردا: (نەبوون و لەناودان و لەناوچوون و گاڵتەجاری و توانەوە و نەمان) ببێت. لە کاتێکدا کە دنیای کافران پڕە لە نەبوون و، جودایی و، گاڵتەجاری و، نەمان.

ئەوەش کە ئەم ڕاستی‌یە ڕوون دەکاتەوە ئەو وتە بەناوبانگەیە کە بەسەر زمانی خەڵکی‌یەوەیە و هەردەم دەیڵێنەوە:

(هەرکەسێك خوا بۆ ئەو ببێت، هەموو شتێکی تریشی بۆ دەبێت.. ئەو کەسەش خوا بۆ ئەو نەبوو، هیچ شتێکی تری بۆ نی‌یە)!

**بە پوختی:**

"ئیمان" هەروەك لە کاتی سەرەمەرگدا مرۆڤ لە ئیعدامی هەمیشەیی ڕزگار دەکات، هەروەها دنیای هەموو کەسێکیش لە چەندین تاریکیی وەك: نەبوون و، لەناودان و، گاڵتەجاڕی و، بێ مەبەستی ڕزگار دەکات. بەڵام کوفر، بە تایبەتی ئەگەر کوفری موتڵەق بێت، ئەو مرۆڤە و دنیا تایبەتی‌یەکەشی بە مردنەکەی لەناو دەبات و دەیخاتە تاریکستانی دۆزەخێکی مەعنەوی‌یەوە و لەزەت و خۆشی‌یەکانیشی دەکات بە خەفەت و ئازار.

دەبا گوێی ئەوانەی فەزڵی ژیانی دنیا بەسەر ئاخیرەتدا دەدەن، بزرنگێتەوە و.. ئەگەر ڕاست دەکەن با چارەیەك بۆ ئەم کارە بدۆزنەوە، یان با بێنە ناو بازنەی ئیمانەوە و، خۆیان لەم زیانە گەورەیە ڕزگار بکەن!

**﴿سبحانك لا علمَ لنا إلاّ ما علّمْتَنا إنّكَ أنتَ العليم الحكيم﴾.**

برای زۆر موشتاق و
ئومێدەواری دوعاکانتان:
**سەعیدی نوورسی**

* * *

## مەسەلەی یازدەهەم

بەروبوومەکانی باوەڕ بە "مەلائیکەت" لە ژیانی دنیادا

درەختی پیرۆزی پایە هەمەکی‌یەکانی ئیمان، چەندین بەروبوومێ هەیە. یەکێك لەوانە: بەهەشتە، یەکێکی تر: بەختەوەریی هەمیشەییە، یەکێکی تر: بینینی خوای گەورەیە.. جا لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور سەدان بەرهەمی هەمەکی و هەندەکی‌یان بە بەڵگەی چەسپێنەرەوە لە (سراج النور)دا باس کردووە، ئەوا خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەکەین. بەڵام لێرەدا تەنها ئاماژە بۆ چەند بەروبوومێکی هەندەکی دەکەین، بەڵکو بۆ بچووکترین بەروبوومی هەندەکی و تایبەت لەو بەروبوومە خۆشانە.

یەکەمیان:

ڕۆژێکیان لەبەر خۆمەوە دوعایەکم بەم واتایە کرد:

(ئەی پەروەردگارا داواکارم و لێت دەپاڕێمەوە کە لەبەر خاتری جیبریل و میکائیل و ئیسرافیل و عیزرائیل و، بە شەفاعەتیان، لە زیانی شەیتانەکانی جینی و ئینس بمپارێزیت).

هەرکە ناوی عیزرائیلم هێنا - کە خەڵکی دەخاتە ترس و لەرزەوە - یەکسەر تامێکی بەلەزەتم لە ناوهێنانیدا چەشت، ئنجا سوپاسی خوای گەورەم کرد و، لەبەر خۆمەوە وتم: "الحمد لله". پاش ئەمە خۆشەویستی‌یەکی

زۆر پاك و بێگەردی عیزرائیلم لە دڵدا چەسپا، چونکە یەکێکە لەو مەلائیکەتانەی کە باوەڕبوون پێیان بە یەکێك لە پایە هەرە گرنگەکانی ئیمان دادەنرێت.

لێرەدا بە کورتی ئاماژە بۆ بەروبوومێکی بچووك لەو بەربوومە لەژمارەبەدەرانە دەکەین، کە لە باوەڕبوون بەم مەلائیکەیەدا هەن:

یەکێك لەوانە:

بێ گومان گرنگترین شت کە مرۆڤ هەیەتی و بە پەرۆشەوە هەوڵی پاراستنی دەدات: "گیان"یەتی. جا کاتێ بیرم کردەوە لەوەی کە مرۆڤ ئەم گیانە بە یەکێکی بەهێز و دەستپاك دەسپێرێت، تاکو لە بێهوودەیی و لەناوچوون بیپارێزێت، کاتێ کە بیرم لەمە کردەوە، هەستم بە دڵنیایی و دڵخۆشییەکی زۆر دەکرد.

پاشان ئەو مەلائیکەتانەم هاتەوە یاد کە کردەوەکانی مرۆڤ تۆمار دەکەن، بەم هۆیەوە چەند بەرهەمێکی بە تام و شیرینی وەك ئەمەی پێشووم بەدی کرد و، خۆشەویستی و ڕێزیانم لە دڵدا دامەزرا.

یەکێك لەو بەرهەمانە ئەوەیە کە مرۆڤ لە پێناوی مانەوەی کردەوە چاك و بەنرخەکانیدا، هەوڵی پاراستن و هەڵگرتنیان دەدات، چ لە ڕێی نووسین و چ لە ڕێی شیعر و چ لە ڕێی شریتەکانی سینەمایشەوە. بە تایبەت گەر لەو جۆرە کردەوانە بن کە لە بەهەشتدا بەروبوومی هەمیشەییان هەیە و دەمێننەوە و مرۆڤ زیاتر حەز لە پاراستنیان دەکات.

بەڵێ، کاتێ ئەو مەلائیکەتانەی کردەوەکانی مرۆڤ تۆمار دەکەن - ئەوانەی کە خوای گەورە بە ﴿كِراماً كاتبين﴾[1] ناویان دەبات - کاتێ ئەم

---

(١) واتە: چەند مەلائیکەتێکتان لەسەرە کە بەندەی بەڕێزی خوای گەورەن و کردەوەکانتان دەنووسنەوە و دەیانپارێزن. (وەرگێڕ)

مەلائیکەتانە لەسەر شانی مرۆڤ ڕادەوەستن، بۆ ئەوەیە کە کردەوەکانی مرۆڤ لە چەندین پیشانگا و دیمەنی هەمیشەییدا دەربخەن و پیشانیان بدەن. تاکو خاوەنەکانیان خەڵاتی بەنرخی هەمیشەیی بەدەست بهێنن. جا لە بەروبوومی ئەم باوەڕەدا تامێکی هێندە شیرینم چەشت کە بە هیچ جۆرێك ناتوانم دەری‌ببڕم و وەسفی بکەم.

لەو کاتەشدا کە گومڕا و سەر لێ شێواوان لە هەموو ئەو هۆکارانەی پەیوەندی‌یان بە ژیانی کۆمەڵایەتیمەوە هەیە بێ بەشیان کردم و، لە کتێب و خۆشەویست و خزمەتگوزارانی دەوروبەرم و هەموو ئەو هۆیانەی دڵنەواییان پێ دەبەخشیم، دووریان خستمەوە و، دووچاری ئاوارەیی و تەنیایی و نامۆییان کردم، لە ناخۆشی و دڵتەنگی‌یەکی وەهادا بووم کە وام هەست دەکرد ئەم دنیا چۆڵ و بێ دەنگەم بەسەردا دەڕووخێت!

لەم دۆخە ناهەموارەدا بووم کە یەکێك لە بەروبوومەکانی (باوەڕ بە مەلائیکەت) بە هانامەوە هات و ڕزگاری کردم و، دنیا تایبەتی‌یەکەم و جیهانی دەوروپشتیشمی بۆ ڕووناك کردمەوە و، بە مەلائیکەت و ڕۆحیانەتە پاکەکان ئاوەدانی کردەوە، بە چەشنێ کە خۆشی و شادمانی هەموو لایەکی گرتەوە[1]. هەروەها ئەم بەروبوومە پیشانی دام کە چەندە جیهانی گومڕا و سەر لێ شێواوان پڕە لە هاوار و ناڵەی تەنیایی و خەم و پەژارەی بێهوودەیی و تاریکی.

---

(١) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "أطت السماء وحق لها ان تئط، ما من موضع أربع أصابع إلا عليه مَلَكٌ واضع جبهته ساجداً لله تعالى". رواه أحمد (١٧٣/٥) والترمذي (زهد/٩) وابن ماجه (زهد/١٩) والحاكم وصححه ووافقه الذهبي. واتە: ئاسمان لەتاو کۆڵی قورسی خۆی و، بە وێنەی ئەو حوشترەی بارەکەی قورس بێت، دەناڵێنێت و هاواری لێ بەرز دەبێتەوە. حەقیشیەتی کە هاواری لێ بەرزبێتەوە، چونکە هەموو جێگایەکی کە بە ئەندازەی چوار پەنجە بێت مەلائیکەتێکی تێدایە، سەری سوژدەی بۆ خوای گەورە تێدا داناوە. (وەرگێڕ)

لەم کاتەدا کە ئەندێشەم لە خۆشیی چەشتنی تام و لەزەتی ئەم بەروبوومە خۆشەدا بوو، هەستی بە یەکێك لە بەروبوومەکانی (باوەڕ بە پێغەمبەران) - دروودی خوایان لەسەر بێت - کرد و، تامی خۆشی ئەم بەرهەمەشی چەشت. هەروەها هەستم کرد کە ئیمانەکەم پتر زیادی کردووە و بووە بە ئیمانێکی گشتی و فراوان. چونکە ئەو ئیمانە کات و سەردەمە رابووردووەکانی پێغەمبەرانی پێشینی بە نووری ئەو پێغەمبەرانە و بە رادەیەکی ئەوتۆ لە بەرچاومدا ڕووناك کردەوە کە وا هەستم دەکرد لەگەڵ ئەواندا دەژیم و، هەریەك لەو پێغەمبەرە بەرێزانەش - لە بەرچاومدا - بە هەزاران جار تەسدیقی پایەکانی ئەو ئیمانەیان دەکرد کە دواهەمین کەسیان ﷺ هێناویەتی و بانگی خەڵکیی بۆ لا کردووە. ئەم هەست کردنەشم بە جۆرێکی وا بوو کە شەیتانی دەمکوت و بێ دەنگ کرد.

پاشان ئەو پرسیارەی کە وەڵامێکی شیفابەخشی هەیە و، لە (بریسکەی: حکمة الإستعاذة)دا[1] باس کراوە، بە دڵمدا هات، کە ئەمەیە:

ئایا بۆچی ئەو ئیماندارانەی کە ئەم هەموو بەروبوومە زۆرەی ئیمان و ئەم سوود و بەرهەمە خۆش و پڕ تام و لەزەتە زۆرەیان هەیە و، لە لایەن خواوەندی میهرەبانی خۆیشیانەوە هەردەم بە چاودێری و میهرەبانی و بەزەیی پشتگیرییان لێ دەکرێت، کە هەموو ئەمانەش پشت و پەنا و هێز و ورەیان پێ دەبەخشن، بۆچی گومڕایان بە سەریاندا سەردەکەون؟ تەنانەت کاتی وا دەبێت کە بیست کەسی گومڕایان بەسەر سەد کەسی ئیمانداردا زاڵ دەبن و پەرێشانیان دەکەن؟!

هەر لە ناوەندی ئەم بیرکردنەوەیەدا، ئەم پرسیارەی تریشم بە دڵدا هات کە: (ئایا بۆچی قورئانی پیرۆز لە بەرامبەر ئەو پیلانە لاوازانەی کە شەیتان بۆ

(١) واتە بریسکەی سیازدەهەم (پەیامی حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان). (وەرگێڕ)

ئیماندارانی ساز دەکات، ئەو هەموو ئایەتانە - یەك لە دوای یەك - سەبارەت بە یارمەتیدانی مەلائیکەتانەوە بۆ ئیمانداران، باس دەکات)؟

لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور حیکمەتی ئەمەیان بە چەندین بەڵگەی بەهێز و سەلمێنەر چەسپاندووە و ڕوونیان کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەکەین:

بەڵێ، لە کاتێکدا کە مرۆڤێکی خراپکار، یان هەر کەسێکی ڕووخێنەر بیەوێت بە دزی‌یەوەوە ئاگر لە کۆشکێك بەربدات و بیڕووخێنێت، ئەوا سەد کەس ڕادەپەڕن و ئەرکی پارێزگاری کردنی ئەو کۆشکە دەخەنە ئەستۆیان، وەك بڵێی سەد کەس هاتبێتن بۆ ڕووخاندن، یان سووتاندنی ئەم کۆشکە! تەنانەت هەندێ جار بۆ پاراستنی کۆشکەکە پەنا دەبرێتە بەر پادشا، یان دەوڵەت. چونکە مانەوەی ئەو کۆشکە بەندە بە مانەوەی ئەو هەموو هەلومەرجانەی کە پێویستن بۆ مانەوەی. بەڵام ڕووخاندن و کاولکردنی، تەنها بە نەمانی یەکێك لەو هەلومەرج و هۆکارانە ڕوودەدات!

ئنجا لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە تێدەگەین کە هەروەك مرۆڤێکی خراپکار دەتوانێت بە تەنها یەك دەنکە شقارتە ئاگر بەربداتە کۆشکێکی گەورە و لەناوی ببات، بە هەمان جۆر، شەیتانەکانی جیننی و ئینسیش بە کردارێکی زۆر کەم و بچووك دەتوانن کاولکاری و تێکدانێکی سەرسووڕهێنەر یان سووتاندنێکی مەعنەویی ئەنجام بدەن.

بەڵێ، بناغە و ناوەرۆکی هەموو تاوان و، ناڕەوایی و، کردارێکی خراپ بریتی‌یە لە نەبوون(العدم) و ڕووخاندن(الهدم)، چونکە هەردەم لە پشتی ئەمانەوە کرداری ناڕەوا و لەکارخستن و نەبوون ڕوودەدات.

جا بەپێی ئەم خاڵەی کە ڕوون کرایەوە، شەیتانەکانی جیننی و ئینس، بە لاوازترین هێزەوە دەتوانن بەرەنگاری هێزێکی گەورە و لەژمارەبەدەری ئەهلی حەق و ڕاستی ببنەوە و تەنگیان پێ هەڵبچنن، هەتا وایان لێ دێت

پەنـا دەبەنە بەر دەرگانەی خوای گەورە و، هەمیشە لـە هـەوڵ و تێکۆشـاندا دەبن. هەر لەبەر ئەمەشە کە دەبینین قورئانی پیرۆز ئەو هەموو یارمەتی‌یە زۆر و زەبەندانەی بۆ دانـاون و، نـەوەدونۆ نـاوی لـە نـاوە جوانـەکانی خـۆی داوە بـە دەستیانەوە و، فەرمانی زۆر توند و بەهێزیان بۆ دەردەکات کە لـە بـەردەم ئـەو دوژمنانەدا خۆیان ڕابگرن!

یەکسەر لەم وەڵامەوە، بناغەی مەسەلەیەکی سەرسووڕهێنەر و، سەرەتای ڕاستی‌یەکی گەورە و گرنگ دەرکەوت، کە بەم جۆرە بوو:

هـەروەك "بەهەشـت" بەرهـەم و ئەنجامـەکانی گشـت جیهانـەکانی بوون(عوالم الوجود) کۆ دەکاتەوە و، هەموو ئەو تۆوانەی لە دنیـادا چێنراون لە بەهەشتدا بەردەگرن و بەهەشت وایان لـێ دەکات کـە بـەروبوومی خۆیـان بـە هەمیشـەیی پێشـکەش بکـەن، هـەر بـەم پێیـەش "دۆزەخ" هـەموو بەروبوومەکانی جیهانی نەبوون(العدم) دەبرژێنێت و دایاندەتەکێنێت، بـۆ ئەوەی ئەنجامە پڕ لە سوێ و ئازاراوی‌یەکانی جیهانـە بێ سنوورەکانی فەنا و نـەبوون دەربخات. چونکـە کارگـەی ترسـناکی دۆزەخ سـەرەڕای ئـەرك و فەرمانـە زۆرەکـانی خـۆی، جیـهانی "بـوون"یش لـە چڵـك و چەپەڵی‌یـەکانی جیهانی "نەبوون" پاك دەکاتەوە.

پشت بـە خـوا ئـەم مەسـەلە گرنگـە لـە پاشـاندا ڕوون دەکەینـەوە، چونکـە نامانـەوێت لـێرەدا دەرگـای لـێ بخەینـە سەرپشـت و، هـەڵی دەگریـن بـۆ جێگایەکی تر.

* * *

هـەروەها یـەکێکی تـر لـە بەروبوومـەکانی (بـاوەڕ بـە مەلائیکـەت) دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕ بە "نەکیر و مونکەر"[1]، کە بەم چەشنەی خوارەوەیە:

---

(١) روى الترمذي (جنائز/٧٠) وأبو داود بمعناه (٢/٥٤٠،٥٤١) وابن ماجـه (جنائـز/٦٥) وأحمد (٣/١٢٦،٤/٢٨٨): "إذا قبر الميت أتاه ملكان أسودان أزرقان يقال لأحدهمـا المنكـر

ڕۆژێکیان لەبەر خۆمەوە وتم:

(دەبێ من - وەك هەموو كەسێكی تر - بێ چەند و چۆن بچمە ناو گۆڕەوە)!

کە ئەمەم وت، یەکسەر بە ئەندێشە وام دانا کە ڕۆشتوومەتە ناو گۆڕەکەمەوە.. ئیتر لەو گۆڕە تاریکەدا کە دەتگوت زیندانی یەك کەسی‌یە، هەستم بە نائومێدی و بێ هاوڕێی و تەنیایی دەکرد..

لەم کاتەدا کە من لەو جێگا تاریك و تەنگ و ساردەدا بە تەنیا مابووم، لەپڕ دوو مەلائیکەت لە دەستەی "نەکیر و مونکەر" هاتن بۆ لام و لەگەڵمدا

---

وللآخر نكير فيقولان: ما كنت تقول في هذا الرجل؟ فيقول ما كان يقول: هو عبدالله ورسوله، فيقولان: قد كنا نعلم أنك تقول هذا، ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعاً في سبعين ثم ينور له فيه، ثم يقال له: نم. فيقول: أرجع إلى أهلي فأخبرهم فيقولان: نم كنومة العروس الذي لا يوقظه إلاّ أحب أهله إليه، حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك. وإن كان منافقاً قال: سمعت الناس يقولون قولاً فقلت مثله، لا أدري. فيقولون: قد علمنا أنك تقول ذلك، فيقال للأرض التئمي عليه، فتختلف أضلاعه فلا يزال فيها معذباً حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك". واتە: ئیمامی تیرمیذی و ئەبوو داوود و ئیبنوماجە و ئەحمەد ئەم فەرموودەیە دەگێڕنەوە: "هەر کە مردوو لە گۆڕەکەیدا دانرا، دوو مەلائیکەتی ڕەش و شین کە یەکێکیان پێی دەوترێ "مونکەر" و ئەوی تریشیان "نەکیر" دێن بۆ لای و پێی دەڵێن: لە دنیادا چیت سەبارەت بەم پیاوە دەوت؟ (مەبەست لەو پیاوە پێغەمبەرە ﷺ) ئەویش لە دنیادا چیی وتووە ئەوە دەڵێتەوە و دەڵێت: "بەندە و پێغەمبەری خوایە". ئنجا پێی دەڵێن: دەمانزانی وا دەڵێیت. پاشان بە ئەندازەی حەفتا گەز پانی و حەفتاش درێژی گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت و ڕووناك دەکرێتەوە. پاشان پێی‌دەڵێن: بخەوە. ئەویش دەڵێت: با بڕۆمەوە ئەم هەواڵە بە کەسوکارم بدەم. پێی‌دەڵێن: بخەوە و هەڵمەسە وەکو ئەو بووکەی کە هەر لە خەودایە تاکو خۆشەویستترین کەسی هەڵی‌دەسێنێت. ئنجا ئەو مرۆڤە لەوێ دەنوێت تاکو خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە. ئەگەر ئەو مرۆڤە مونافیق بووبێت، لە وەڵامی ئەواندا دەڵێت: نازانم! گوێم لێ بوو خەڵکی لە بارەی ئەوەوە شتێکیان دەوت، منیش ئەوەم دەوتەوە. ئەوانیش پێی‌دەڵێن: دەمانزانی وا دەڵێیت. دوای ئەوە بە زەوی دەوترێ: لە ئاستی ئەم مردووەدا بە یەکەوە بلکێ، زەویش بە یەکەوە دەلکێتەوە و پەراسووەکانی بۆ ڕاست و چەپ دەکات و، هەتا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە، ئەو لە سزادا دەبێت. (وەرگێڕ)

کەوتنە وتوویژ، بە چەشنێ کە دڵی تەنگ و گۆڕی تەسکی منیان بۆ فراوان کردم. ئیتر گۆڕەکەم و دڵم ڕووناك و گەرم بوونەوە و، هەستم کرد کە چەند دەروازەیەکم بەسەر جیهانی بەرزەخدا لێ خرایە سەرپشت..

هەر لەو ئەندێشەیەدا دڵم تا بڵێی گەشایەوە و، لەسەر ئەو حاڵەی کە ئێستا بە ئەندێشە بینیم و لە ئایندەشدا بە حەتمی دێتەدی، سوپاس و ستایشی زۆرم پێشکەشی خوای گەورە کرد.

دەگێڕنەوە کە قوتابییەك لە کاتی خوێندنی وانەکانی (نەحو و صەرف)دا کۆچی دوایی دەکات. نەکیر و مونکەر لە گۆڕدا لێی دەپرسن: (مَنْ رَبُّكَ)؟ پێیان دەڵێت: (مَنْ) موبتەدایە و (رَبُّكَ)ش خەبەرەکەیەتی، پرسیارێکی قورسم لێ بکەن ئەمە ئاسانە!! لای وایە هێشتا لە قوتابخانەدایە و خەریکی وانە خوێندنە!

جا هەروەك ئەم وەڵامە هەموو ئەو مەلائیکەتانە و ئەو ڕۆحیانەتانەی کە لەوێ ئامادە بوون و ئەو (وەلی)یەش کە گۆڕی پیشان درا و ئەم ڕووداوەی بینی؛ هەموو ئەوانەی خستە پێکەنین، تەنانەت هەروەك بەزەیی خوای گەورەش کەوتە زەردەخەنە و لە ئازار ڕزگاری کرد..

بە هەمان جۆر، پاڵەوانێکی شەهیدیش لە پاڵەوانانی پەیامەکانی نوور (واتە حافظ عەلی)[1] کە لە بەندیخانەدا و لە دەمی خوێندنەوە و نووسینەوەی پەیامی (بەری درەختی ئیمان)دا کۆچی دوایی کرد، هەروەك وەڵامی پرسیارەکانی دادگای بە ڕاستییەکانی ئەو پەیامە دایەوە، لە گۆڕەکەشیدا وەڵامی پرسیاری ئەو دوو مەلائیکەیە بە ڕاستییەکانی ئەم پەیامە دەداتەوە.

---

(١) "حافظ عەلی" یەکێکە لە قوتابییە دێرینەکانی مامۆستا نوورسی کە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە. لە ڕێی هیممەتی بەرز و خەتە خۆشەکەیەوە گەلێ خزمەتی لە بواری نووسینەوەی پەیامەکاندا ئەنجام داوە. ساڵی ١٩٤٤ز لە بەندیخانەی "دەنیزلی" ژەهری دەرخوارد دراوە و شەهید کراوە. خوای گەرە بە میهرەبانیی فراوانی خۆی شادی بکات. (وەرگێڕ)

هەروەها من و هەموو قوتابیانی تری پەیامەکانی نووریش وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە ئێستا "مەجاز"ن و لە ئایندەدا "حەقیقەت"ن، بە بەڵگە ڕەنگین و بەهێز و توندوتۆڵەوەکانی پەیامەکانی نوور دەدەینەوە و، کارێك دەکەین کە ئەو مەلائیکەتانە تەسدیق و پەسەندی بکەن و، ڕێزی خۆیان لە ئاستیدا بنوێنن.

* * *

هەروەها نموونەیەکی تری هەندەکیی "باوەڕ بە مەلائیکەت" هەیە کە دەبێت بە تەوەرەی بەختەوەریی ژیانی دنیا، کە بەم جۆرەیە:

لە کاتێکدا منداڵێکی پاکی بێ گوناه خەریکی خوێندنی وانەکانی ئیمان و سەرەتاکانی (فیقهـ) بوو، منداڵێکی هاوڕێی هات بۆ لای و باسی مردنی برایەکی خاوێن و بێ گوناهی خۆی بۆ کرد. ئەمیش دڵخۆشیی دایەوە و پێی وت:

(برام! مەگری.. شوکری خوا بکە.. چونکە براکەت لەگەڵ مەلائیکەتەکاندا ڕۆشتووە بۆ بەهەشت و لەوێ بەوپەڕی ئازادیەوە دەگەڕێت و، دڵنیابە کە حەوانەوە و خۆشیی ئەو لەوێ، لەچاو هی ئێمە لێرە گەلێ زیاترە. ئەو لەوێ لەگەڵ مەلائیکەتاندا دەفڕێت و هەموو جێگایەك دەگەڕێت و دەبینێت).

بەم جۆرە، گریە و زاریی هاوڕێکەی لابرد و گۆڕیی بە خۆشی و پێکەنین.

منیش (واتە نووسەر) وەك ئەو منداڵە چاو پڕ لە فرمێسکە وام. چونکە سەرەڕای ئەو بارە ئازاربەخشەی کە لەم زستانە پڕ لە پەژارە و خەفەتەدا هاتە ڕێم، دەنگوباسی پڕ لە خەم و پەژارەی کۆچی دوایی دوو کەسیشم لە خۆشەویستانم پێ گەیشت!

یەکەمیان: (فوئادی برازام) بوو، کە یەکەمیی قوتابخانە باڵاکانی بەدەست هێنابوو، هەروەك ڕاستی‌یەکانی پەیامەکانی نووریشی بڵاو دەکردەوە.

دووهەمیشیان: (خانمی خوشکم) بوو کە ئافرەتێکی زانا بوو، لە کاتی حەج و تەوافی کەعبەدا گیانی سپارد.

لە کاتێکدا کە دەنگوباسی مردنی ئەم دوانە منی کردە گریان بە چەشنی ئەو گریانەی لە مردنی "عەبدوڕڕەحمان"دا[1] هاتە رێم (وەك لە پەیامی پیراندا باس کراوە) لەم کاتەدا، بە دڵ و دەروون هاوڕێیەتیی مەلائیکەت و حۆرییەکانم لەگەڵ ئەو لاوە پاك و ئافرەتە خواپەرستەدا، لە بریی هاوڕێیەتی خەڵکی، دەبینی. هەروەها ڕزگاربوونیانم لە دەردیسەری و تاوانەکانی دنیا دەبینی. ئیتر کە ئەمەم بەهۆی نووری ئیمانەوە دی، دەستم بە شوکرانەبژێریی خوای گەورە کرد، کە ئەو خەفەت و پەژارە و ئازارەی بۆ گۆڕیم بە خۆشی و هەستکردن بە شادمانی. ئنجا پیرۆزباییم لەوان و لە خۆم و لە باوکی فوئادیش (عەبدولمەجیدی برام)[2] کرد.

بۆیە لێرەشدا ئەمە نووسرا، تاکو ئەو دوو خوا لێخۆشبووە بەرەکەتی دوعایان پێ بگات.

هەرچی بەراوردکاری و تەرازووکاریی عەقڵی لە پەیامەکانی نووردا بەکارهێنراون و باس کراون، هەموویان بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەی

---

(١) ناوی "عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵلا"یە و برازای مامۆستا نوورسی‌یە. لە سالی (١٩٠٣ز) لە گوندی "نوورس" لە دایك بووە و، لە سالی (١٩٢٨ز)دا لە گوندی "زولفەزل"ی نزیکی ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. ژیاننامەیەکی مامۆستا نوورسیی نووسیوە کە هەر لە سەرەتای ژیان و لەدایکبوونی مامۆستاوە تا سالی ١٩١٨ز باسی ژیانی ئەوی تێدا کردووە و، لە کتێبێکدا کە لە ئەستەمبووڵ چاپی کردبوو، بلاوی کردەوە. (وەرگێڕ)

(٢) بچووکترینی براکانی مامۆستا نوورسی‌یە. بەشێکی لە پەیامەکانی نوور کردووە بە عەرەبی، هەروەك "إشارات الإعجاز" و "المثنوي العربي النوري"یشی کردووە بە تورکی. لە پێشدا مامۆستای زمانی عەرەبی و، پاشان موفتی و، ئنجا مامۆستای زانستە ئیسلامی‌یەکان بووە لە پەیمانگای بالای شاری "قۆنیا". لە سالی ١٩٦٧ز لە تەمەنی هەشتا و سێ سالیدا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

بەروبوومەکانی بەختەوەری و ئاکامەکانی ئیمانە، چ لە دنیادا و چ لە دواڕۆژدا. جا هەروەك بەروبوومە هەمەکی‌یەکانی ئیمان بەختەوەریی ژیانی دنیا پیشان دەدەن و، لە درێژایی تەمەندا ئەو بەختەوەری‌یە بەو خاوەن ئیمانە دەبەخشن و پێی دەچێژن، هەروەها هەمان بەروبووم ئەوەش دەردەخەن کە ئیمانی هەر باوەڕدارێك بەختەوەریی دواڕۆژی پێ دەبەخشێت و، ئاماژەن بۆ ئەوەی "بەختەوەریی ئیمان" کە لەم دنیادا بەری گرت، لەو دنیاشدا بەر دەگرێت و دەردەکەوێت.

لەو نموونانەی کە چەند بەروبوومێکی هەمەکیی ئەو ئیمانە دەردەخەن، (دە) دانە بەروبوومم نووسی، پێنجیان هی میعراجە لە کۆتایی وتەی سی و یەکەمدا و، پێنجیشیان لە "لقی پێنجەمی وتەی بیست و چوارەم"دایە.

* * *

هەروەك پێش ئێستا باسی ئەوەمان کرد کە هەریەکە لە پایەکانی ئیمان بەروبوومی لەئەندازەبەدەری خۆی هەیە، هەروەها دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم پایانەی ئیمان پێکەوە و بە گشتی چەندین بەروبوومی لەژمارەبەدەریان هەیە..

یەکێك لەوانە: بەهەشتە..

یەکێکی تریان: بەختەوەریی هەمیشەییە..

یەکێکی تر: کە لە هەموویان بەتامولەزەتترە، بینینی خوای گەورەیە لە بەهەشتدا.

لەو بەراوردکاری‌یەی کە لە کۆتایی "وتەی سی و دووهەم"دایە، چەند بەروبوومێکی ئەو ئیمانەی کە تەوەرەی بەختەوەریی هەردوو دنیایە، باس کراوە.

* * *

بەڵگە لەسەر ئەوەش کە "بـاوەڕ بە قـەدەر" بەروبوومی گـەورە و بـەنرخی هەر لە ژیانی دنیادا هەیە، ئەو "وتە"یە کە بە وێنەی پەندێك هەموان دەماودەم دەیگێڕنەوە و، دەڵێن: "من آمَنَ بالقدر أمِنَ من الکدر". واتـە: ئـەو کەسـەی باوەڕی بە "قەدەر" هەبێت، لە هەموو لێڵی‌یەکی ژیان بێ وەی دەبێت.

لـە کۆتـایی "پـەیامی قـەدەر"یشـدا، یـەکێك لـە بەروبوومـە گشـتی‌یەکانی "باوەڕ بە قەدەر"م بە نموونەیەکی جوان ڕوون کردووەتـەوە، کـە ڕۆشـتنی دوو پیاوەکەیە بۆ ناو باخچەی کۆشکی پادشایەك.. هتد.

تەنانەت مـن خۆیشـم لـە درێژایی ژیـانمدا، بـە هـەزاران تاقیکردنەوە، بۆم ڕوون بووەتەوە کە بە بێ ئیمان بوون بە "قەدەر" هیچ بەختەوەری‌یەك لە ژیانی دنیادا نامێنێت.

چونکە ئەگەر ئەم ئیمانە نەبێت ئەو بەختەوەری‌یـە لـەناو دەچێت. لـەوەش زیاتر؛ سەرنجم داوە کە هەرکات لە گۆشـەی بـاوەڕ بـە قـەدەرەوە دەمڕوانی‌یـە ئەو گیروگرفتـە ئازاربەخشـانەی دەهاتنـە ڕێـم، یەکسـەر ئـەرك و قورسـی ئـەو گرفت و موسیبەتانەم لەسەر شان کەم دەبوونەوە. ئنجا بە سەرسووڕمانەوە لە خۆمم دەپرسی:

(ئایا ئەو کەسەی باوەڕی بە قەدەر نی‌یە، چۆن دەتوانێت بژی)؟!

* * *

لە مەقامی دووهەمی "وتەی بیست و دووهەم"دا ئاماژەمـان بـۆ یـەکێك لـە بەروبوومە هەمەکی‌یەکانی پایەی ئیمانیی "باوەڕ بە مەلائیکەت" بەم چەشـنەی خوارەوە کردووە:

حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - عەرزی خوای کرد:

(کاتێ مـن فەرمـانی گیانکێشـان ئـەنجام دەدەم، بـەندەکانت لێـم وەڕس دەبن و سکاڵام لە دەست دەکەن).

لە وەڵامدا پێی وترا:

(هەرچی نەخۆشی و بەڵا و موسیبەت هەن، دەیانکەم بە پەردەو، لە بەردەم ئەم کارمەندییەی تۆدا دایاندەنێم، بۆ ئەوەی سکاڵا لە دەست تۆ نەکەن و بە هی ئەو هۆکارانەی بزانن).

لە ڕاستیدا خودی فەرمانبەرییەکەی حەزرەتی عیزرائیلیش پەردەیەکە وەك ئەو پەردانە، تاکو سکاڵای ناڕەوا ڕوو لە خوای گەورە نەکات! چونکە لەبەر ئەوەی خەڵکی تەنها سەیری دیوی دەرەوەی شتان دەکەن، ئەوا ئەو دانایی و میهرەبانی و جوانی و بەرژەوەندییەی کە لە مردندا هەن، هەموو کەسێك نایانبینێت و دەست بە بیانوو و سکاڵا کردن دەکات. جا لەبەر ئەم دانستە (واتە: لەبەر ئەوەی سکاڵای ناڕەوا ڕوو لە خواوەندی میهرەبان نەکات) حەزرەتی عیزرائیلیش کراوە بە پەردەیەك لە بەردەم قەدەرەکانی خوای گەورەدا، وەك هەموو پەردەکانی تر.

کار و ئەرکەکانی هەموو مەلائیکەتان و گشت هۆکارە ئاشکراکانیش تێکڕا وەك ئەمەی باسمان کرد، بریتین لە چەند پەردەیەك کە لە بەردەم عیززەتی پەروەردگارێتیی خوادا دانراون. تاکو توانست و پاکی و بێگەردی و میهرەبانییە فراوانەکەی عیززەتی خوا لەو شتانەدا کە لایەنە جوانەکانیان نابینرێن و ڕاستییەکانی حیکمەتیان نازانرێن، پارێزراو بن و هیچ سکاڵایەکی ناڕەوا ڕوویان تێ نەکات و، دەستی ڕاستەوخۆی توانستی خوا لەو شتە هەندەکییانەدا نەبینرێت کە بە سەیرکردنی ئاشکرا و ڕواڵەتی بە کەمنرخ و پێچەوانەی بەزەیی دێنە بەرچاو.

بەڵێ، هەموو ئەمانە پەردەن لە بەردەم ئەو توانستەدا، دەنا هیچ هۆکارێك نییە کاریگەریی ڕاستەقینەی ببێت. تەنانەت هەر لە تواناشیدا نییە هیچ شتێك لە نەبوونەوە بهێنێتە بوون.

لە لایەکی ترەوە، پەیامەکانی نوور بە بەڵگە زۆر و فراوانەکانیان چەسپاندوویانە کە: تەمغە و مۆری "یەکتایی" خوای گەورە لەسەر هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرە دراوە و..

هەروەها چەسپاندوویانە کە: بەدیهێنان تایبەتە تەنیا بە خوای گەورەوە و، هۆکارەکان لە پەردە زیاتر نین. مەلائیکەتانیش، کە خاوەنی هەست و شعوورن، تەنها بەشێکی "جوزئی ئیختیاری" نەبێت هیچی تریان نییە. ئەم جوزئە ئیختیارییەش تواناى بەدەستهێنان (الکسب)ی هەیە، نەك بەدیهێنان (الخلق). ئەو بەدەستهێنانەش جگە لە جۆرە خزمەت و پەرستشێکی عەمەلی شتێکی تر نییە.

بەڵێ، عیززەت و گەورەیی خوا، خواستیان لەسەر دانانی پەردە ئاشکراکانە لە بەردەم چاوی ژیریدا، بەلام "یەکتایی" و "شکۆمەندی"ی خوای گەورە دەستی ئەو هۆکارانە دەبەنە دواوە و لە کاریگەریی ڕاستەقینە دووریان دەخەنەوە.

جا هەروەك مەلائیکەتەکان و هۆکارە ئاشکراکان لە کاروباری "خێر" و "بوون"دا و لەو شتانەدا کە لایەنی جوانییان نابینرێت، دەخرێنەکار و، بەمەش دەبن بە چەند هۆیەك بۆ تەقدیس کردن و ڕێزلێنانی پەروەردگار، تاکو توانستەکەی بپارێزن لەوەی کە تەقسیر و ستەمی بدرێتە پاڵ.. بە هەمان جۆر، بەکارهێنانی شەیتانەکانی جینی و ئینس و تۆخمە زیانبەخشەکانی "شەڕ" و "نەبوون"یش جۆرە خزمەتگوزارییەکە بۆ تەقدیس کردن و ڕێز لێگرتن و پاك بۆڕوانینی پەروەردگار لە هەموو ئەو شتانەی کە لە بوونەوەردا بە ناتەواوی بەرچاو بکەون.

لەبەر ئەمە، هەموو ئەوانە توانستی خواوەند دەپارێزن لەوەی کە ستەمی بدرێتە پاڵ یان سکاڵای ناڕەوای ئاراستە بکرێت. چونکە هەموو تەقسیر و ناتەواوییەك لە "نەبوون" و دەستەوسانی و، پشتگوێ خستنی ئەرکەکانی

سەرشانەوە پەیدا دەبن، کە هەریەك لەوانەش - لە ڕاستیدا - "نەبوون"ە.
هەروەها لەو کردەوانەوە پەیدا دەبن کە "نەبوو"ن و "بوون"یان نی‌یە.

کەواتە ئەم پەردانەی کە لە شەیتانەکان و شتە زیانبەخشەکان پێکهاتوون، بەهۆی ئەوەی کە هەرچی سکاڵا و ڕەخنەی لەمەڕ ئەو تەقسیرانە هەیە، دەگرنە خۆیان، ئەوا لەم ڕێیەوە بوونەتە هۆی ئەوەی کە خواوەند تەقدیس بکرێت و لەو سکالایانە بپارێزرێت.

چونکە هیچ کردارێکی زیانبەخش و ڕووخێنەر و نەبوو، پێویستی بە دەستەڵات و هێز نی‌یە. بەڵکو تەنها کردارێکی بچووك یان هێزێکی هەندەکی، تەنانەت لە هەندێ کاتدا پشتگوێ خستنی کارێك، سەری لە "نەبوون" و "فەساد"ەوە دەردەچێت! هەر لەبەر ئەوەشە گومان وا دەبرێت کە ئەو کەسەی کردەوە زیانبەخشەکەی ئەنجام داوە خاوەنی توانابێت. کەچی لە ڕاستیدا لە "نەبوون"دا نەبێت هیچ کاریگەری‌یەکی نی‌یە و، لە بەدەستهێنانی هەندەکی بەولاوە هیچ هێزێکی تری نی‌یە.

جا لەبەر ئەوەی ئەو کردەوە خراپانە لە "نەبوون"ەوە پەیدا بوون، ئەوا خراپکاران بە بکەری ڕاستەقینەیان دادەنرێن. خۆ ئەگەر خاوەن هەست و شعوور بوون، ئەوا شایستەی ئەوە دەبن کە سزای خۆیان بچێژن. ئەمەش تێماندەگەیەنێت کە ئەو خراپکارە زیانبەخشانە بە بکەری کردەوە خراپەکانیان دادەنرێن.

بەڵام لە کردەوەی خێر و چاکەدا، لەبەر ئەوەی ئەو کردەوانە دارای "بوون"ن ئەوا ئەو خێرخواهانەی کە ئەنجامیان داون، بە بکەری ڕاستەقینەیان ناژمێررێن، بەڵکو شایستەی ئەوەن ئەو کردەوە چاکانەیان لەسەر دەست ڕووبدات. پاداشتدانەوەشیان لەسەر ئەو کردەوانە تەنها بەهۆی لێشاوی بەرەکەتی خوای گەورەوەیە.

ئەمەش قورئانی پیرۆز لەم فەرمانەدا ڕوونی کردووەتەوە کە دەفەرموێ:

﴿ما أصابَكَ مِنْ حَسَنةٍ فَمِنَ اللهِ وما أصابَكَ مِنْ سَيِّئةٍ فَمِنْ نَفسِكَ﴾(النساء:٧٩).

**بە كورتی:**

كاتێ كە جیهانەكانی "بوون" و جیهانەكانی "نەبوون" بەیەكدا دێن و، "بەهەشت" و "دۆزەخ" بەرهەم دەهێنن..

كاتێ كە هەموو جیهانەكانی بوون (الحمد لله.. الحمد لله) و، جیهانەكانی نەبوونیش (سبحان الله.. سبحان الله) دەڵێنەوە و دووپاتیان دەكەنەوە..

تەنانەت كاتێ مەلائیكەت و شەیتانەكان و، كردەوە چاك و خراپەكان دەكەونە زۆرانەوە..

لەوەش زیاتر؛ كاتێ كە لە دەوری دڵدا "ئیلهام" و "وەسوەسە" دەست بە دەمقاڵێ و موناقەشە دەكەن..

كاتێ بەپێی یاسای زۆرانبازیی گشتی هەموو ئەمانە ڕوو دەدەن..

ئەو كاتە، یەكێك لە بەروبوومە زۆرەكانی "باوەڕ بە مەلائیكەت" دەردەكەوێت و كۆتایی بە مەسەلەكە دەهێنێت و گیروگرفتەكانیش چارەسەر دەكات و، بوونەوەری تاریك و نوتەك ڕووناك دەكاتەوە و، یەكێك لە نوورەكانی ئایەتی: ﴿اللهُ نورُ السَّمواتِ وَالأَرْضِ﴾ دەردەخات و، هەندێكمان لە شیرینی ئەو نوورە پێ دەچێژێت، كە تابڵێی شیرین و بەتامە!!

* * *

لە لایەكی تریشەوە "وتەی بیست و چوارەم" و "وتەی بیست و نۆهەم" ئاماژەیان بۆ بەروبوومێكی تری هەمەكی كردووە و، بوونی مەلائیكەت و ئەرك و فەرمانەكانی ئەوانیان چەسپاندووە.

بەڵێ، پێویستە لە بەرامبەر ئەو پەروەردگارێتی‌یە گەورە و فراوان و میهرەبانەی کە بە هەرچی شتی هەمەکی و هەندەکی هەیە - کە لە هەموو سووچ و گۆشەیەکی بوونەوەردا بڵاوی کردوونەتەوە - خۆی دەناسێنێت و خۆی لە لای ئەوان خۆشەویست دەکات..

پێویستە لە بەرامبەر ئەمەوە، بەندایەتی‌یەکی گەورە و فراوان بێت کە لە چوارچێوەی تەقدیس و شوکر و ستایشدا پێشکەشی بکات.

جا لەبەر ئەوەی جەمادەکان و لایەنە گەورە و مەزنە بێ هەست و گیانەکانی بوونەوەر ناتوانن ئەم بەندایەتی‌یە گەورەیە ئەنجام بدەن، ئەوا مەلائیکەتە لەژمارەبەدەرەکان لە بریی ئەوان ئەم بەندایەتی‌یە دەنوێنن. هەر مەلائیکەتانن کە بەوپەڕی دانست و گەورەییەوە دەتوانن کاروبارەکانی پەروەردگارێتیی خواوەند لە هەموو گۆشە و کەنارێکی بوونەوەر و گشت بەشەکانیدا بەرێ بکەن، هەر لەسەر ڕووی زەوی‌یەوە هەتا ئەستێرەکان و، هەر لە ناخی زەویشەوە تا دەگاتە بڵندترین جێگای ناو بۆشایی ئاسمانەکان.

بۆ نموونە:

ئەو یاسا بێ گیان و مردووانەی کە فەلسەفە لە بۆچوونی خۆیدا بۆ دروستبوونی زەوی و کارمەندی‌یە سروشتی‌یەکەی، بە شێوەیەکی تاریك و سامناك دەریاندەبڕێت و پیشانیان دەدات، ئەم بەرهەمەی ئیمان دەیگۆڕێت و لە شێوەیەکی دڵڕفێنی ڕووناکدا پیشانی دەدات..

ئەوەتا ئەو دوو مەلائیکەتەی کە بە "گا" و "نەهەنگ" ناونراون، گۆی زەوی لەسەر شانی خۆیان - واتە: لە ژێر چاودێری‌یاندا - هەڵدەگرن و، ئەو ماددەیەش کە سەر بە ژیانی دواڕۆژە و بە سەنگ (الصخرة) ناونراوە و لە بەهەشتەوە هێنراوە، بۆ ئەوەیە کە ببێت بە بەردی بناغەی هەمیشەیی و لەناونەچووی ئەم زەوی‌یە فانی‌یە..

واتە هێمای ئەوەیە كە هەندێ لـە بەشـەكانی ئـەم زەوی‌یـە، زەوی‌یـان لـێ چۆڵ دەكرێت و دەنێررێن بۆ بەهەشت و، بۆ ئـەوەش كـە ببێـت بـە پاڵپشـت و جێ پێی ئەو دوو مەلائیكەتەی كە بە "گا" و "نەهەنگ" ناونراون.

ئـەم ڕیوایەتـە بـەم جـۆرە لـە هـەندێ پێغەمبـەرانی پێشـووی بـەنی ئیسـرائیل گێرراوەتەوە و، بە هـەمان جۆریـش لـە ئیـبن عەبباسـەوە - خوایـان لـێ ڕازی بێت - دەیگێڕنەوە. بەڵام زۆر جێی داخە كە ئەم تەشبیهە جوان و، ناوەڕۆك و واتا بەرز و بڵندە - بە درێژایی كات - لە لایەن نەزانانـەوە بگۆڕرێـت و، ئـەو دوو مەلائیكەتە بە جەستەی ماددی لە قەڵەم بدرێن، بە چەشنێك كـە هـەرگیز لە چوارچێوەی بیركردنەوەكانی ژیریدا جێی نەبێتەوە!

بەڵێ، ئەمە زۆر جێی داخە، چونكە مادەم مەلائیكەت لەناو خـاك و گـڵ و بـەرد و هەموو جێگایـەكـی سـەرزەویدا (هـەروەك لە هــەوادا) بتـوانن بێـن و بڕۆن و، ئەركی سەرشـانی خۆیـان جێبـەجێ بكـەن، ئیـتر چ ئـەوان و چ گـۆی زەویش هیچ پێویستی‌یەكیان بە جەستەیەكی ماددیی بەردین یان گا و نەهەنگ نی‌یە تاكو لەسەری ڕاگیر ببن. بە واتایـەكی تـر: مەبەست لـەم ڕیوایەتـە تەنـها لێچواندن(تشبیە)ە و هیچی تر نی‌یە[1].

---

(١) عن مالك في قوله عز وجل: ﴿وسع كرسيه السموات والأرض﴾ قال: إن الصخرة الـتي تحت الأرض السابعة، ومنتهى الخلق، على أرجائها أربعة من الملائكة، لكل ملك منهم أربعـة وجوه: وجه إنسان ووجه أسد، ووجه نسر، ووجه ثور، فهم قيام عليها قد أحاطوا بـالأرض والسموات ورؤسهم تحت الكرسي والكرسي (تحت) العرش. قال: وهو واضع رجليه تبـارك وتعالى على الكرسي.

أخرجه عبدالله بن الإمام احمد في كتاب (السنة) برقم ٥٨٩، ٣٠٢/١ في إسناده مجهول والمـدى معروف بالوهم وبقية رجاله ثقات. وعزاه السيوطي في الدر المنثور ٣٢٩/١ لعبد بن حميد وأبـو الشيخ في العظمة وأخرجه أيضاً البيهقي في الأسماء والصفات ص/٤٠٣ وقد أخرجه عبد الرزاق وعبد بن حميد وابن المنذر كما في الدر المنثور باختلاف في السياق ٢٦١/٦ من كلام وهب بن منبه وهو ثقة كثير النقل من كتب الإسرائيليات. (انظر الميزان ٣٥٢/٤). (وەرگێڕ - لـە چاپە عەرەبی‌یەكەوە هێناویەتی)

نموونەیەکی تر:

لەبەر ئەوەی گۆی زەوی بە ژمارەی سەری جۆرەکان(الانواع)ی ناو خۆی لە ڕووەك و گیاندار و بێ گیان و، بە ئەندازەی زمانی تاکەکانی ئەو جۆرانە و، بە ئەندازەی ئەندام و گەڵا و بەروبوومەکانیان، سوپاس و تەسبیحاتی خوای خۆی دەکات.

ئاشکرایە کە پێشکەش کردن و نواندن و ڕاگەیاندنی ئەم تەسبیحات و سوپاسە سروشتییە بێ هەست و زۆر گەورەیە (لە ڕێگای هەست و شعوورەوە) لە بەردەم بارەگای موقەددەسی خواوەنددا، کارێکە لە توانای خۆیدا نییە. لەبەر ئەوە، بە حەتمی پێویستی بە مەلائیکەتێك دەبێت ئەم کارە ئەنجام بدات کە چل هەزار سەری ببێت و، لە هەر سەرێکیشدا چل هەزار زمانی ببێت، کە بە هەریەکەیان چل هەزار تەسبیحاتی خواوەند بکات، هەروەك هەواڵدەری ڕاستگۆ ﷺ ڕایگەیاندووە.

بەڵێ، یەکێك لە داخوازییەکانی گەورەیی و شکۆمەندیی پەروەردگارێتیی خواوەند ئەوەیە حەزرەتی جیبریل - دروودی لەسەر بێت - کە ئەرکی گەیاندن و پەیوەندییەکانی نێوان پەروەردگار و ئەو مرۆڤەی پێی سپێرراوە کە پوختەترین و بەڕێزترینی بەدیهێنراوانی بوونەوەرە، یەکێك لەو داخوازییانە ئەوەیە کە ئەم مەلائیکەتە (جیبریل) لەسەر شێوە و چۆنێتییەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر بێت[1].

هەروەها داخوازی ئەوە دەبن کە عیزرائیل و ئیسرافیلیش - درووودیان لەسەر بێت - لەسەر شێوە و چۆنێتییەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر بن و،

---

(١) لە حەدیثی صەحیحدا، کە ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، ئەوە هاتووە کە حەزرەتی جیبریل شەش سەد باڵی هەیە، سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: صحيح البخاري ١٤٠/٤٦، صحيح المسلم ١٠٩/١، اللوءلوء والمرجان ٤١/١. (وەرگێڕ)

دەوری نواندنی - تەنها نواندن - کاروبارە تایبەتی‌یەکانی خواوەندی بەدیهێنەر ببینن و، بە پەرستنێکی خاوێن و دڵسۆزانەوە سەرپەرشتیی گەورەترین شتی لەمەڕ جیهانی بوونەوەران بکەن، کە بریتی‌یە لە مردن و زیندووکردنەوە.

هەروەها داخوازی ئەوە دەبن کە میکائیلیش - دروودی لەسەر بێت - بە هەمان جۆر لەسەر شێوە و چۆنێتی‌یەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر بێت. چونکە ئەم مەلائیکەتە بە هەست و شعوورێکی تەواو، هەموو جۆرەکانی ئەو شوکر و ستایشە بێ هەستانە لەسەر چاکە و بەخششەکانی خواوەند، دەردەبڕێت و دەنوێنێت لەو ڕۆزی‌یەدا کە گەورەترین بازنەی ژیان و بەرینترین کەمەرەی بەزەییە و، لە هەموویشیان زیاتر هەست پێ کراوە. ئەمە چ جای ئەوەی کە سەرپەرشتیشیان دەکات.

بەڵێ، یەکێك لە داخوازی‌یەکانی گەورەیی و شکۆمەندیی پەروەردگاریّتی خوای گەورە: "مانەوەی گیان"ە و، بوونی ئەو مەلائیکەتانەیە لە چۆنێتی‌یەکی سەیر و سەرسووڕهێنەردا. چونکە بوونی ئەوان و هەموو تیرە تایبەتی‌یەکانیان هیچ گومانێکی تێدا نی‌یە و، بە دڵنیاییەکی ئەوتۆ چەسپاوە کە شایانی چەسپاندنی بوونی ئەو پەروەردگاری و شکۆمەندی‌یە ئاشکرا و ڕوونەیە کە لە بوونەوەردا وەك خۆر دیارە. ئیتر با تێگەشتنمان بۆ بەشەکانی تری مەلائیکەت بەم پێ‌یە و بەم لێکدانەوەیە بێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە چوارسەد هەزار جۆری زیندەوەر لەسەر ڕووی زەویدا بەدی دەهێنێت، تەنانەت لە ئاسایی ترین مادده و شتە بۆگەنەکان چەندین گیانداری زۆر بەدی دەهێنێت و، سەر ڕووی زەوی‌یان پێ ئاوەدان دەکاتەوە و، وایان لێ دەکات کە لە بەردەم موعجیزەی کرداری خوادا بە سەرسووڕمانەوە بڵێن: "ماشاء اللّٰه، بارك اللّٰه، سبحان اللّٰه"..

ئەو خوایەی کە وای لە گیانداره وردەکانیش کردووە کە لە بەردەم چاکە و نیعمەتە فراوانەکەی میهرەبانیی خوادا پڕ بە دەم بڵێن: "الحمد لله والشکر لله والله اکبر"..

ئەو خواوەندە شکۆمەند و خاوەن گەورەیی و جوانی و توانستەی کە ئەم کارانە ئەنجام دەدات، بێ هیچ گومانێك، ئاسمانە بەرین و فراوانەکانی بە چەندین خاوەن گیان(روحانیات)ی ئەوتۆ کە لەگەڵ ئەو ئاسمانانەدا بگونجێن، نیشتەجێ کردووە، لەوانەی کە لە فەرمانەکانی دەرناچن و هەردەم لە بەندایەتیدان بۆی.

کەواتە ئەو ئاسمانانە بە چۆڵی ناهێڵێتەوە و، بەوان ئاوەدانیان دەکاتەوە. بۆ ئەمەش ئەوەندە مەلائیکەتی جۆراوجۆری بەدی هێناوە کە گەلێ لە جۆر و چینەکانی زیندەوەرانی تر زیاترن..

چونکە جۆرێکیان ئەوەندە بچووکن کە سواری پشتی کلووی بەفر و دڵۆپی بارانەکان دەبن و، بە زمانی تایبەتیی خۆیان شەوق و خۆشەویستییان لە بەرامبەر بەدیهێنان و میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە دەردەبڕن..

هەندێکی تریشیان سواری هەسارە گەڕۆکەکان دەبن و هەردەم لە گەشتی بۆشایی بەرینی گەردووندان و، بەم زیکر و تەهلیلەیەی کە لە بەردەم گەورەیی و پەروەردگاریتیی خوادا دەیکەن، بەندایەتیی خۆیان بۆ خواوەند، لە پێش چاوی هەموو جیهان ڕادەگەیەنن[1].

بەڵێ، یەکگرتنی وتەی گشت کتێبە ئاسمانییەکان و هەموو ئایینەکان، لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا ئێستا، لەسەر

(١) روى أبو داود بسند صحيح أن النبي ﷺ قال: أُذن لي أن أتحدث عن مَلَكٍ من حَمَلة العرش رجلاه في الأرض السفلى وعلى قرنه العرش، ومن شحمة أذنه وعاتقه خفقان الطير سبعمائة عام فيقول ذلك الملك: سبحانك حيث كنت! (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

بوونی مەلائیکەتان و بەندایەتی‌یان بۆ خوای خۆیان. هەروەها ئەو ڕیوایەت و فەرموودە زۆر و دوور لە گومانانەی کە باسی وتوویژ دەکەن لەگەڵ مەلائیکەتدا کە بە درێژایی گشت چەرخەکان ئەم وتوویژە ڕووی داوە..

هەموو ئەمانە.. بە بێ ئەوەی هیچ گومانێك بهێڵنەوە، "بوونی مەلائیکەت" و "پەیوەندی‌یان لەگەڵماندا" دەچەسپێنن، بە چەشنی گومان نەبوونمان لە بوونی ئەوانەی کە نەماندیون و لە ئەمریکادا دەژین.

ئێستاش تامی ئەم بەروبوومە هەمەکی‌یەی دووهەمی ئیمان بچێژە و، بە نووری ئیمان بۆی بڕوانە و، بزانە کە چۆن هەموو گەردوون و بوونەوەرانی خستووەتە شەوق و مەراقەوە و، ئاوەدانی کردووەتەوە و، ڕازاندوویەتەوە و، کردوویەتی بە پەرستگا و مزگەوتێکی گەورە و فراوان..

چونکە ئەو بوونەوەرەی کە فەلسەفە و زانست تاریك و سارد و بێ ژیان پیشانی دەدەن، بەهۆی ئیمانەوە، دەبێت بە بوونەوەرێکی خاوەن ژیان و هەست و شعوور و، ڕووناك دەبێتەوە و، تام و لەزەتێکی خۆش دەبەخشێت.

جا ئەم بەرهەمەی ئیمان تیشکێکی لەزەتی خۆشی ژیانی ئەودنیا، هەر لەم دنیایەدا، بە ئیمانداران - هەر کەسەو بەپێی پلەی ئیمانەکەی - دەبەخشێت.

* * *

## پاشماوە:

هەروەك بەهۆی نهێنی "وەحدەت" و "ئەحەدییەتەوە" لە هەموو سووچ و گۆشەیەکی بوونەوەردا: هەمان توانست و، هەمان ناو و، هەمان داهێنان هەیە و.. هەموو بەدیهێنراوێك - بە هەمەکی و هەندەکییانەوە - بە زمانی حاڵ: یەکتایی و، توانست و، پەروەردگاریێتی و، بەدیهێنان و، قودسییەتی خواوەندی بەدیهێنەر ڕادەگەیەنن..

بە هەمان جۆر، ئەو خواوەندە لە هەموو جێیەکی بوونەوەریشدا چەندین مەلائیکەت بەدی دەهێنیت، تاکو بە زمانە زۆرەکانیان - کە هەردەم لە زیکری خوادا پاراون - تەسبیحاتی ئەو بەدیهێنراوانە دەربڕن و پێشکەشیان بکەن، کە بە زمانی حاڵ و پێویستیی خۆیان دەیانکەن. چونکە مەلائیکەتەکان هەرگیز سەرپێچی لە فەرمانەکانی خوای گەورە ناکەن و، جگە لە "بەندایەتی" هیچی تر شك نابەن و، هەرگیز توانای بەدیهێنان و دروستکردنیان نییە. تەنانەت ناتوانن هیچ کارێك، بە بێ فەرمان و ڕوخسەت، بکەن. لەوەش زیاتر؛ هیچ پاڕانەوە و تکا و شەفاعەتێکیان پێ ناکرێت مەگەر ڕوخسەت لە خوای گەورە بخوازن. هەر لەبەر ئەوەشە کە بەم پایە و پلەیە شەرەفمەند بوون کە خوا باسی دەکات و دەفەرموێ:

﴿بل عبادٌ مُكرَمون﴾ (الأنبياء:٢٦).

﴿وَيفعلون ما يُؤمرون﴾ (التحريم:٦).

* * *

# پێرستی بابەتەکان